

# ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات



نووسینی : ڤیلادیمیر فیدروفسکی

وەرگێڕانی : شێرزاد هەینی



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات

ئەفسانەی شەمەندەفەرێکی ئەورووپایە

- نووسینی: فلادیمیر فیدوروفسکی
- وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: سلیمە لبال
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: شێرزاد هەینی
- بابەت: ڕۆمان
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- ژمارەی سپاردن: ٥١٥
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٣٦٢)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشەکی

ئەو رۆمانە (گێڕانەوەیە) رووداوەکانی بۆ سالی ۱۸۷۲ دەگەڕێتەوە، لەو سالەدا ئەندازیاری گەنجی بەلژیکی جۆرج نجلماکرس بریاری دامەزراندنی کۆمەلگەی هێلی ئاسنینی لە ئەورووپا داوە، ئەو دەزگایەش وەك ئەو دەزگایانە بێت، کە ئەو زووتر بینیویەتی.

ئەو ئەندازیارە گەنجە تەمەنی ۲۷ سالان بووە کە سەردانی ئەمریکای کردووە، لەوێ بیرۆکەکەی هاتۆتە خەیال، بە فارگۆنە تایبەتییەکەی نووستن سەرسام بووە، ئەو فارگۆنە نووستنانە لە ناو شەمەندەفەرەکانی ئەمریکا باوبووە، یەکەمجار لە سالی ۱۸٦۰ فارگۆنی بە پەردە و بە سیستەمی تایبەتی هەبووە. نجلماکرسی ئەندازیار فارگۆنەکەی بە فارگۆنێکی داخراوی روو لە لایەکی کراوە لە سالی ۱۸۷٦ دوە بینیووە، لەوێشەوە بریاری دروستکردنی کۆمەلگەی نێونەتەوەیی بۆ فارگۆنی نووستن داوە.

ئەو سەردەمە لە ئەوروپا هێلە ئاسنینەکانی گواستنەوە جیاوازی نێوانیان هەبووە، هەر ولاتەو هێلەکانی نێوانیان بە شێوەیەکی تایبەتی بووە، بۆیە پێویستی بە بەرنامەیەك هەبووە بۆ گۆڕین و گونجاندنیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. کە ترێنی ئەمریکی ولاتانی ئەورووپی گرتەوە، زوو بیر لەو کێشەیە کرایەوە، تا بتوانێ خزمەتی زۆرتر بە ئیسراحەت و خۆشی بگەیێنێتە بەکارهێنەرانی ترێنەکە، نجلماکرس زیرەکانە بیری لە چارەسەر کردەوە، بیری لە بەرنامەیەکی هاوشێوە و هاوتەریب بۆ هەموو ولاتەکان کردیتەوە، ئەویش نوێکردنەوە و دانانی بەرنامەی نوێ بۆ هێلەکانی ترێنی ئەورووپا بوو.

## پەیدابوونی ترێنی خۆرهەڵات

لە ساڵی ١٨٨٤ کۆمپانیای نجلساکرس بە ناوی کۆمەڵی فارکۆنی نووستن و گەورەترین ترێنی خێرا لە ئەورووپا دامەزرا. بە ماوەیەکی کورت ئەو کۆمپانیایە ناوبانگێکی زۆری پەیداکرد؛ مۆڵەتی ڕێکخستنی گەشتە ڕەسمییەکانی زۆربەی چالاکییەکانی پاشایەتی ئەورووپیی وەرگرت، بەو مۆڵەتە زورتر سەرکەوتن و ویستنی لەبەر چاوان دانا، ئەوەش لە ترێنی خێراکەی خۆرهەڵات خۆی دۆزییەوە، چیرۆکەکەش ناوێتەی سەرچلی و گیانبازی مرۆڤایەتی و خۆشی و پەلەبەرزی تەکنەلۆژی ئاست بەرزیان پێوەیە.

ساڵانە ترێنی نوێی لە ئاسیا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دروستکردووە، تا ئێستاش ناوبانگیان ماوە، وەک دێری شیعری بەجۆش سەدایان ماوە، وەک ترێنی زێرین و ترێنی بەرەو سیبیریا و ترێنی ئەستێرەی باکوور و ترێنی شین. ترێنی شین فارکۆنەکانی کرابوونە سەماکە، بالیەکانی مۆسیقاکەی لە داریۆس میلهۆد و دەقەکانیشی لە جین کوکتۆ و جلوبەرگەکانیشی لە کۆکۆ شازل و پەردەکانی لە بیکاسۆوە وەرگرتبوو.

لە چێشتخانەکانی ئەو ترێنەش چەندین دیداری زۆر نهێنی کراوە. هەروەها ئەو ترێنە بوویتە دیکۆری فلیمی (تاوانی ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات)ی سیدنی لۆمی، هەروەها ئەو ترێنە باشترین وەسیلەی گەیاندن و گواستنەوەی کۆکۆ شانیل و ساشا فیتری بووە لە مۆنتیکارلۆوە بۆ ڤیینا و لە پاریسەوە بۆ سانتپیترسبۆرگ و لە مەدریدەوە بۆ قستنتینیە، ئەو ترێنە بوویتە ترێنی پاشاکان، یان بڵێین پاشای ترێنەکان. ئەو ترێنە بووە خەمی گەورەی نووسەرانی وەک ئاجاتا کریستی و فالێری لاربود موروند و بییر ماك ئولان و ژمارەیەکی زۆری شاژنانی ئازدار و چەندین شازادە و گەورە دۆقەکان و لۆردەکان و بەگزادە هەنگارییەکان و دەوڵەمەندەکانی ڕۆمان و سەرمایەدارانی زەویوزاری زۆر.

یەکێك لەوانە وتبووی:

ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات ئەو ڕێگایەی بە سێ سەعات دەبڕێت!

## رەمزی ئەورووپا

ترێنی خۆرهەڵاتی خێرا، نەك تەنها ترێنێکی خێرا بووە و بەس، بەڵکو ئەو ترێنە رەمزی ئەورووپاش بوو، چونکە ئەو دەمانە هێشتا ئەورووپا خۆی باش نەکرتبوو، دەروازەکەی بۆ پیاوانی کار و دەوڵەت و ناودارانی توێژە دیارەکانی خستبووە سەرپشت، بەو ترێنە عاشقانی سەفەر و کەڕان لە وشکایی دەرکایان بۆ کرایەوە. لەناو ترێنەکەی ئەندازیارە بەلژیکییەکە چەندین رووداو و بەسەرهاتی درامی تێدا رووداوە، پاڵەوانی ئەو درامایانەش کەسانی کارای بواری سیاسی و تۆڕەکانی هەواڵگری بووینە.

لە فارکۆنی ژمارە ٢٤١٩ دا بە فەرمانی حکوومەتی فەرەنسی ئەو فارگۆنە کراوەتە نووسینگەی ماریشال فۆك، لەوێ رێککەوتننامەی ئاگربەستی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ١١ ی نۆڤمبەری ١٩١٨ لێ بەسترا.

پاش بیست ساڵ لە هەمان فارکۆندا هیتلر ئیمزای رووخانی مۆرکردووە.

ترۆتسکی بەو فارکۆنە سەفەری کردووە، لەو فارکۆنەدا فەرمانی دامەزراندنی سوپای سووری دەرکردووە. دیپلۆماسێکی کارمەندی سویدی لە بودابست بەو ترێنەوە ٢٠ هەزار جولەکەی لە دەستی نازییەکان لە رۆژانی شەڕی دووەمی جیهاندا رزگارکردووە.

خروتشۆف ئەودی پاش ستالین دەستبەکاربووە، بەو ترێنە سەفەری کردووە، لەناو ئەو ترێنەدا بڕیار و بەرنامەی دیواری بەرلینی نێوان هەردوو بەشەکەی بەرلینی بۆ هاتووە. کارمەندانی هەواڵگری خۆرئاواو هەتا ئەوانەی بۆ بەرژەوەندی کرملینیش کاریان کردووە، بۆ کەڕان بەدوای نێچیرەکانیان سواری ئەو ترێنە بووینە.

# نهێنییەکان .. نهێنییەکان

لە گەشتەکانی ناو ترێنەکەدا لە سەدەی بیستەم سەدان پەردەی شاراوە و دەمامکی نهێنی لەسەر زۆر ڕووداوی سیاسیی گرنگ و چارەنووسساز هەڵدراوەتەوە. یەکێك لەو پلانانە کۆششی کوشتنی ترۆتسکی بووە، تورەکەش ئەندامی هەواڵگری سەر بە ستالین بووینە، ئەو دەزگایە جاسووسییە توانیبووی جاسووس لە چواردەوری هیتلریش بچێنێت.

منیش زۆر بیر لەوە دەکەمەوە قەدەرێك دێت ئەو نهێنییانە ئاشکرا بکەین و شوێنە شاراوەکان بدۆزینەوە، بەو شێوەیە لە ڕۆمانی (سانت پیترسبورگ) توانیسان، ئەو کەسانەی لەو سەردەمانەدا کاریگەرییان هەبووە ناونووسیان بکەمەوە. ئەوەمان بۆ سازبوو.

بیرۆکەی ناجلمکرس برو توانی ئەورووپا بەیەك ببەستێتەوە و ئەو کیانبازییانە سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە، بەو پرۆژەیە بە یەك پلیت دەتوانی لەو ناوچەیە بگەڕێیت و سنوورەکان ببڕیت و وێنە و دیمەنی نازدار ببینیت. زۆر کەسایەتی دیاری ئەو جیهانە سواری ئەو ترێنە بووینە و سەفەریان کردووە، لەوانە دامەزرێنەری بالیە ڕووسی دیاگیلاف و گیانبازی هۆلەندی ماتا هاری، ئەوەی لە ڕۆژانی شەڕی یەکەمی جیهان نووسینگەکەی لەناو ئەو ترێنەدا لەنێوان پاریس- پراگ دامەزراندبوو. لەو ترێنەش جاسووسی ئینگلیزیی ناسراو لۆرنسی عەرەب و مارلین دیتریش سەفەریان کردووە، ئەوەی لە ڕۆژانی گەشەی نازییەت لەناو جوانترین چیرۆکی خۆشەویستیدا ژیاون.

ڕاوول والنبرگیش لەو ترێنە بووە. لەو کۆتاییانەشدا ڤاتسلاف هافلی سەرکردەی ئۆپۆزسیونی هەنگاری ئەوەی پاشان بووە یەکەم سەرۆکی چیکۆسلۆڤاکیای ئازاد و

رەمزی کرانەوەی خۆرهەلات و لێدانی زەنگی رزگارکردنی پراگ و کۆتایی هوساهێنی ئەو سەردەمە تا هەتا هەتاییێ. رابەری ئەمجارەمان بۆ زانینی زانیاری زۆرتر لەباە ترێنی خۆرهەڵاتی خێراکە، مێردە گەنجە نیویۆرکییەکە بوو، ئەوەی قەدەر بەرەو نووسینەوەی ئەو کتێبەی بردم.

## قەدەر

(کای) بە نەژاد ئەڵمانی بووە، (ئەنا ئالف رنسیە)ی ژنیشی بە نەژاد رووسی بووە، لە نیویۆرك لەو شارە جەنجاڵەدا ژیان دەبەنە سەر، ئەو ژنە گەنجە چالاکی و بزێوییەکەی لە باب و باپیرانیەوە بۆ ماوەتەوە، لە تەمەنی ۱۸ ساڵییەوە زماڵەی خوێندنی لە خوێندنگا باشەکانەوە بۆ هاتووە، سەرەتا لە زانکۆی کمبریدج و پاشان لە زانکۆی ئێم بی تای لە ولایەتە یەکگرتووەکان خوێندیەتی و خوێندنی لە ئابووری تەواوکردووە، لەبەر زیرەکی هەموو لە نیویۆرك بە کیژۆلە زێرینەکە ناویان ناوە، هەموو نیشانەکان هێمای ئەوەیان پێوەبووە قەدەر هاوشانی دەبێت.

بیرۆکەیەك ئەو ژن و مێردەی هەراسان کردبوو، ئەنا سەرقاڵی ئەوە بوو ریشە و بنەوانی باب و باپیرانی خۆی بدۆزێتەوە، لەبەر مێژووی رەشی وڵاتەکەی ئەیدەویست لاپەرە رەشەکانی مێژووی ئەورووپا هەڵبداتەوە. لە پشوویەکی خۆیاندا بیری ئەوەیان کردووە بەرەو ئەسیا رابکەن و کەمێك دووربکەونەوە، ئەنا بیری لەوە کردەوە لە خاڵێکی دەرچوونەوە لە دوارۆژی کیشوەری ئەورووپی بگات، ئەوەش رەنگە لە پاریس یان لە پراگ یان لە ئەستەنبۆڵەوە دەبێت. کە تەماشای کارتی سەفەر بە ترێنی خۆرهەڵاتی خێرایان کرد، هەستیان بەوەکرد ئەو ترێنە مەرامی ئەوان جێبەجێ دەکات، چونکە ئەو رێگایە نێوان تورکیا و رووسیا و پراگ و پاریس و ڤینیسیا دەبەستێتەوە، بۆیە ژنەکە ویستی مێردەکەی رازی بکات بەو ترێنە سەفەر بکەن.

بەیانییەك وتوێژێكیان لە مانهاتن بۆ ئەو سەفەرە كرد، ئەنجامەكەی بەرنامەی سەفەرەكەیان براندەوە. بە تەلەفۆنێكی پزیشكی تایبەتی ئەن بیرزكەكە بە تەواوی گۆڕا، پزیشكەكە داوای كرد تەنیا بێتە سەردانی و دوا راپۆرتی تاقیگەی پێرابگەیێنێت. ئەناش ماوەیەك پێشتر ئەو پشكنینەی كردبوو. هەردووڵا چوونەوە سەركاری خۆیان بە هیوای ئەوەی نیوەڕۆیەكەی لەلای دكتۆرەكە یەكتری ببینەوە.

ژنێكی شۆخ، بە ڕوو خۆشییەوە پێشوازی كردن و فەرمووی ژوورەوەی لێكردن.

- فەرموون دانیشن.

دكتۆرەكە پەنجەكانی هەردوو دەستی بەیەكتریەوە دەجوڵاند و وتی:

خاتوونەكەم من بە چوار ڕێگاوە بۆت ئاهێمە پێش، تۆ تووشی كانسەر (شێرپەنجە) بوویت.

بەو قسەیە ژن و مێردەكە ڕوویان زەرد هەڵگەڕا و بەرگەی ئەو هەواڵەیان نەگرت.

كای بە هیواوە وتی:

دەكرێ ئەوەش چارەسەر بكرێت، چاك دەبێتەوە!

دكتۆرە ژنەكە بە ساردییەوە، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی هەستی بڕژاوی ئەوان بكات، وتی:

بەداخەوە لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەرئەنجامەی پشكنینەكە من هیوای چاكبوونەوە نابینم، ڕێژەی چاكبوونەوەكەی تەنها ٢٪ ە!

ژن و مێردەكە هەستیان بە فەوتان كرد و ترووسكاییەك هیوایان لەبەر چاوان بۆ خۆشی نەما، هەموو پرۆژەكانیان با بردی، لەبەر داماوی ئەوان، ئەو ڕۆژە كەنداوی هودسۆن بە هەورێكی ڕەش ئاسمانەكەی ئەڕكردبوو. پێش ئەو سەعاتە ژیانیان جوان بوو، ڕۆژانە كە پەنجەرەی شوقەكەیان دەكردەوە پەیكەری ئازادی بەڕوویان بە شادییەوە دەردەكەوت.

كە گەڕانەوە ماڵەوە بە جووتە تا چاوەكانیان سوور هەڵگەڕا گریان، مێردەكە ترسا نەوەك ژنەكەی لە نهۆمی ٢٧مینی باڵەخانەكەوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوە، تەنیا

شانبەرز لە رووی پەنجەرەکە وەستا و چەپکە کوڵەکەی ژوورەوەی بە ئاسمانەوە فڕێدایە خوارەوە. لە نیوچەوانیەوە رەشبینی و بیری دزێوەی لیَ دەباری، هیچی بۆ نەمایەوە بە قسەی دکتۆرەکەی، نەشتەرگەرییش سوودی نەما تا بیکات. پاش چەند رۆژێك مێردەکە سەردانی دکتۆرەکەی کردەوە، نەیدەویست ئەوە قەبووڵ بکات، لەو سەردانەدا بە دکتۆرەکەی وت من ژنەکەم بە مامۆستایەکی ناوداری بەڕێوەبەری بنکەی زانستی کارنەر لە نیویۆرك نیشاندەدەم. ژنەکە نەیدەویست هەمان ئەنجام و وەڵامی پشکنین لە یەکێکی ترەوە ببیستێتەوە، بۆیە سەرەتا رازی نەبوو خۆی بە دکتۆری تر نیشان بدات، بەڵام کای مێردی سووربوو لەسەرئەوەی سەردانی ئەو مامۆستایە بکەن. ئەویش بەناچاری قەبووڵی کرد.

ئەنا بە رەنگە کەسکەکەی پشتی بە دیواری ژووری پێشوازی دکتۆرەکە دابوو، ئەو رۆژە شاری مانهاتن بە تەمێکی بەیانییانە داپۆشرابوو. ئەگەرچی کای مێردی قسەشی بۆ دەکرد، بەڵام ئەو هۆشی لای ئەو نەبوو، دەم نا دەمی زیندەوەرێك لەبەردەمی دەفڕی و دەنیشتەوە، لەو دەمەدا قسەیەکی منالّی بەبیر هاتەوە کە دەوترا:

نابی زیندەوەری زستانان بکوژیت، چونکە یادگاری هاوینی رابردوون و مژدەی سەرەتای پاییزە.

نۆرەی ئەوە هات پرۆفیسۆرەکە پێشوازییان بکات، پرۆفیسۆرەکە پیاوێکی چینی تەمەن گەورەبوو، لەگەڵ رۆژگارا بەڕاستی ببووە پیاوێکی نیویۆرکی تەواو و حەزی بە یاری بیسبۆلیش کردووە، هەموو دەمێك ئامادەیی هەبوو بۆ هەڵگرتنی رووبەڕووبوونەوەکان. کە چوونە ژوورەوە بە رووی ئەو دوو گەنجە پێکەنی و وتی:

دەی گەنجەکان بۆم بگێڕنەوە چیرۆکەکەتان چییە. سەرلەنوێ بۆم بگێڕنەوە.

پاش ئەوەی سەربردەکەیان بۆ گێڕایەوە، هەردوو چاوە کچکەکانی زەق بوونەوە، دەموچاوی هاتە پێشەوە و بە تووڕەییەوە وتبووی کە پێشوازی ئەکردنەوە، دیانەی ئەویستن تەنها لەبەر ئەوەی ئێوە ئەتانویست نەشتەرگەری بکەن، هەر لەبەر ئەوە .. نۆ‌ه!

زوو پرۆفیسۆرەکە بە هێمنی و بە بێدەنگییەکی ترسناکەوە بەرەو ژنە دکتۆرەکەیان رۆیشتبوو، پاش کاتێك گەڕایەوە لای ژن و مێردەکە. ئەنا و کای ماندوو و شێواو دیاربوون، هەفتەیەك بوو تێر خەو نەبوون، ئەگەرچی دایك و باوکیان و هاوڕێیەکانیان زۆر خەمیان بۆ خواردبوون و زۆریش چاودێرییان کردبوون. بەلام چاویان بە گریانەوە دیاربوو. ئەو ماوەیەش خۆیان خزاندبووە گوندێکی کەچکەی لاچەپ، ئەنا بە حەبێکی خەو باش خەوی لێدەکەوت، بەلام بەردەوام بە هاوار و زیڕەوە لە خەوەکەی بەئاگاهاتووە، هاوارەکەی ئاوێتە زریان و بایە بەهێزەکەی بەر پەنجەرەی ژووری نووستنەکەی ببوو.

کە تەلەفۆنەکە لێدرا چەندین بیرۆکە مێروولە ئاسا لە مێشکی وروژان، ویستی وەڵامی تەلەفۆنەکە نەداتەوە، بەلام کای مێردی بە دەستی ئیشارەتی بۆ کرد وەلام بداتەوە. دەنگە گەورە دڕەکەی پرۆفیسۆرەکە نیگەرانی کرد:

خاتوونەکەم، ئەگەرچی من زۆرجار بەوە ناسراوم هەوالی ناخۆش بە خەلکی رادەگەێنم، بەلام هەوالەکەی ئەمجارە خۆشییە، من پێت دەڵێم تۆ نەخۆشی کانسەرت نییە!

لە وەلامدا ئەنا بە سەرسامییەوە وتبووی چۆن!

ئەویش لە وەلامدا وتبووی:

ئێستا ئامێری ژماردنی پێشکەوتوو هەیە، ئەوانە ئەنجامی خێرا و وردیش دەردەکەن، لەو ئەنجامانەدا یەکێك ورد و دروست نەبێت، ئەوە تەواوی ئەنجامەکەی ناو کۆمپیوتەرەکە بە هەلە نیشان دەدات، دیارە ئەوەش هاتیتە پێش دکتۆرە کەنجە ژنەکەی هاوپیشەم، ئەوەی زیانتی کردبووە گردوو، ئەو ئەشتەرگەرییەی زووتر بۆت کراوە، شوێنەوارەکەی نیشانەی ئەوەی داوە، کە تۆ دووچاری شێرپەنجە بوویت. ئەگەر ئەو هەلەیە کلاسیکی بێت یان مرۆڤایەتی بێت، ئەوەیان دەبێت. بەلام ئەوەی نامرۆڤایەتییەکە ئەوەیە دەستت لەو بابەتە بشۆیت و لە کۆڵ خۆتی بکەیتەوە.

من قسەم لەگەڵ ئەو پرۆفیسۆرە کرد کە سەرپەرشتی ئەوی کردبوو، چۆن ئەو هەڵەیە لە دەستنیشانکردنەکە رووی داوە، لە وەڵامدا وتبووی:

من تازە ئەو ئەرکەم لەو مەڵبەندە وەرگرتبوو، من بڕواری ئەوەم نەداوە ئەو دکتۆرە ژنە لەو مەڵبەندە کاربکات، لەوەش دڵنیام.

لەو ساتانەدا (ئەنا) دایك و باوکی بەو شەو دردنگە لە خەو بە ناگاهێنابوو، سەعات سێی بەیانی بوو.

کای لە تەلەفۆنەکە هاواری کردبوو ئەنا کانسەری نییە!! سەرەتا زۆری نەمابوو شێت بن، کە ئەو هەواڵەیان زانی و لە راستییەکەی گەیشتن، هەموو لایەك لە خۆشیا گریابوون. دایك و باوکە مردنی کیژەکەیان دانابوو، کای ئەمانی ژنەکەی دانابوو، ئەناش ژیانی نامێنێت. ئەو هەواڵە ناهەنگی دەویست، بەڵام کای نەیدەویست ئەنا و دایکی جێبهێڵێت. ئەوان دەیانویست زۆرتر لە پشکنینەکان بکۆڵنەوە و زۆرتر دڵنیابن. باوکی ژنە کەنجەکە بە تووڕەییەوە چەند کەرەستەی ژوورەکەشی شکاند و هاواری کردبوو و وتبووی ئەو موعجیزەیە دووبارە پشکنینی ناوێت.

بەیانی پرۆفیسۆرەکە دووبارە خۆی تەلەفۆنی بۆ ئەنا کردبۆوە.

- ئەوە بەرپرسیارییەتییەکی گەورەیە، من ئەو نموونەیەم بەبێ ناو، بۆ دوو مەڵبەندی ناوداری باش لە تکساس و کالیفۆرنیا رەوانە دەکەمەوە.

دەرچوونی ئەنجامی ئەو پشکنینە ١٥ رۆژی دەویست، ئەو چاوەڕوانییەش بۆ ئەو ژن و مێردە ترسناك و کوشتن بوو، لەو ماوەیەدا هەمووڵایەك بۆ سەلامەتی منداڵەکان و دایك و باوکیان نوێژیان کرد .. لەو رەوشەدا ترسێکی کوشندە لە ئارادابوو.

هەمووڵایەك بەختیاربوون، پاش ٥ رۆژ ئەنجامی پشکنینەکە دەرچوو، بەختیاربوون بۆچوونەکەی ئەو لەسەر نەخۆش نەبوونی ژنەکە تەواوبوو. ئەو دوو کەنجە پاش ئەو شۆکە گەورەیە، بۆ یەکەمجار چوونە پشوودانێکی درێژ. ئەو دیدارەشیان بۆ دیداری میتافیزقی نەبوو، بۆ دۆزینەوەی رەچەڵەکیان بوو، ئەو سەفەرەیان بۆ ژیان بوو.

به ڕێکەوت چیرۆکی کەڕان بەردو دۆزینەوەی ڕەچەڵەک ڕۆیشتن، لەلای برادەرێکیان لە شەقامی پێنجەم داودتکرابوون، بەرێز (زیللک) پیاوێکی کاری کاراسە و فەیلەسووفێکی ناوداربوو، ئەنا پێشنیاری کرد کتێبخانەکەی ببینێت، لەناو کتێبە دەگمەنەکانیدا، کتێبێکی ڕەنگ ئەرخەوانی بە ناوی دامەزراوی ئەلکسەندر یاکلوفلف و بەڵگەنامەکانی کەوتە بەرچاو.

زیللك وتبووی:

سەرۆکی ڕێکخراو بۆ دیموکراسی، ئەو کەسە ڕێزی زۆرم بۆی هەیە، زۆر دیدارمان بووە، تا ئیمرۆش ئەو پەیوەندییەمان ماوە. بێ گومان منیش زۆرم لە برسترۆیکا بیستووە، ئەو بەڵگەنامەیەش باسی ئەو بابەتە دەکات، من ئەو کتێبەم لا پیرۆزە، چونکە کوڕە مامێکم لەگەڵ ئەو تۆڕە بووە، تۆڕی ولنبرگی دپلۆماسی سویدی، پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٥ لە بودابست لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەت بۆ قەڵاچۆکردنی جاسووسی بگیرێت، گیانی زۆری جولەکەیان لە ڕۆژانی شەڕی دووەمی جیهان ڕزگارکردووە. بە پەنجە نیشارەتی بە ناوی کتێبەکە کرد.

ئەنا ناوی باپیرانی بێ سەروشوێنی لە ساڵی ١٩٤٥ەوە دۆزییەوە. بۆی ڕوون بۆوە کەوا ئەوانیش ئەندامی ئەو تۆڕە بووینە، بەردەوام پرسی ئەوەی لە هزرا هەبوو، دەبێ چۆن و کەی و لەکوێ دایك و باوکی مردوون!

پیرەمێردەکە زانی ئەو ژنە گەنجە زۆر پەرۆشە، وێڵە بە دوای مەبەستێك بۆیە بەڵێنی بە ئەنا دا، بە هۆی ئەلکسەندر یاکلوفلفی برادەری چەندین نهێنی بۆ ئاشکرا بکات.

---

## گەشتێك بۆ دۆزینەوەی رەگ و رەچەڵەك

قەدەر وای هێنا پاش دوو مانگ (کا)ی بەو ترێنەی کە لە ساڵی ١٩٥٤ سەردانی مۆسکۆی پێ کردبوو، ئەوجارەش لەسەر داوای دەستەیەك ئابووریزانی رووسی کەنج، یلتسین لە سەرەتای نۆهەدەکان چەندین زانا و شارەزا و سەرمایەکوزاری بێکانە و ئەمریکی بۆ بەرنامەرێژی ئابووری کەرتی تایبەت و سەرلەنوێ دارشتنەوەی زۆری دامەزراوە رووسییەکان داوەتکردبوو، پێش دوو مانگ دووبارە قەدەر ئەوی بردەوە مۆسکۆ.

رەوشەکەی ئەو کاتەی پاش نەمانی شیوعییەت ئەوەی دەخواست، دەبێ مۆسکۆ لە رەگ و ریشەوە گۆڕان بکات، کۆڕان لە هەموو لایەکەوە بووە بەرنامە، لە ئوگستی ١٩٩١ و بە ئاکاداری و سەرپەرشتی کی جی بی، دەستەیەکی ریفۆرمیستی گۆڕان و چوونەپێشەوە پێویست بوو بکەونە کار، تا بە هیچ شێوەیەك نەگەرێنەوە پاشەوە و رژێمە شیوعییەتەکە نەکەرێتەوە، بۆیە کاری بەردەوامی گۆڕان لە ئارادابووە، کۆرانەکان لە رووی سیاسی و هونەری بوون. ئەکەرچی کەرتی تایبەت و بەرنامەرێژی لە بوارێکی تاریك و نادیار دەرۆیشت بەڵام لە نێوان ساڵانی ١٩٩٢ تا ١٩٩٤ رەوشەکە باش بەردەو کۆڕان و بۆ پێشەوە دەچوو...

## بەرگی بانکەکان

لە نێوان شەو و رۆژێکدا بەرپرسە گەورە شیوعییەکان و وەزیرەکان و بەرپرسەکانی تری دەوڵەت و حزب هەموو شتیان لەبیرچوو، لە سەرەتای رۆژانی برسترویکا سامانی زۆریان کۆکردەوە، بەرگی کار و پیاوانی بازاڕ و سەرمایەیان پۆشی، بوونە دەستەیەکی ئابووری بەهێز و تەواوی بازاڕ کار، خۆیان و سامانەکەیان لە ژێر چاودێری و دیتنی کی جی بی (دەزگای موخابەراتی رووسی) بوون، ناویان ئابوون ملیاردێرە

بوارپێدراوەکان، بەو شێوەیە سەرمایەی نیشتیمانی کەوا لە رووسیا پەیدابوو. ئەو ماوەیەی (کای) لە مۆسکۆ مایەوە بە بوونی کەندەڵی دارایی و وەرگرتنی ئاشەرعی پارە تووشی شۆك ببوو، ئەو چووە سەردانی ئەو شوێنانەی گۆگۆل و تۆلستۆی و پوشکینی تێدا ژیابوو، لەو خانووە گەڕابوو کە بولگاکوف رۆمانی (مامۆستا و مارگیت)ی تێدا نووسیبوو، زۆر لە هاوڕێیەکانی ژنەکەی ئەوی دۆزییەوە و دیانەی کردن.

## گیانە مردووەکان

ئەو شوێنەی کە رۆژانێك گۆگۆلی ناودار بەشی دووەمی (گیانە مردووەکانی) تێدا نووسیبوو، ئێستا بوویتە مۆزەخانەیەکی تایبەت. لەبەردەم ئەو ماڵەش رەتببوو کە پۆشکینی تێدا بەزاوا بووە و سەردەمێکیش تێدا ژیاوە، لەو شوێنەدا شاکارە بەنرخەکەی (شەڕ و ئاشتی)ی بەبیرهاتووە، ئەوەی زۆر جوان وەسفی هوتێلە گەورەکەی کۆنتیسە رۆستۆنی ناسراو لەناو هەموو مۆسکۆ کردووە. ئەو کتێبەی هێشتا لەو باڵەخانەیەدا هەیبەتی هەیە، ئەو بینایەی بوویتە ماڵی نووسەران. لەبەر راستییەکی شێوە شێواودا وێنە ئەفسوناوییەکانی مۆسکۆ وا خەریکە کوم دەبێت، ئەو گەڕەکە بوویتە شوێنی بازاری رەش و مامەڵە و کڕین و فرۆشتنی ناشەرعی، بوویتە نوایەك بۆ رووسە نوێیەکان، بەو ئاکارە رەنگ شین و خاکی و وەنەوەشەییانە هەیبەتیکی بۆ خۆی نواندووە، ئەو دەڤەرە، ئەو وێنەیەی سیمایەکی بچووکی داوەتە کۆشکەکە. بەو هەموو کەندەڵی و شێواوییەی رووسیا لەبەر چاوی (کای) هەر نەمرد، لە بەرکە راستییەکەی خۆییەوە دیار نییە.

## پەیامنێری شەڕ

پاش گەڕانێکی دوورودرێژ نیوەڕۆکەی پیاودکە بە رێگایەکی بازنەیی کەیشتە پێش رێکخراوەکەی یکلوفلۆف، کە دەکەوێتە باڵەخانەیەکی بچووکی سێ نهۆمی، ئەگەرچی هەستی بە داوەشانیش دەکرد، بەڵام شانازیشی بەو کەسایەتییە کرد، ئەوەی

موخابەراتی کی جی بی بە پەیامنێری شەڕ و بە رووخێنەری یەکێتی سۆڤیەت و سەرۆکی دەستەی ماسۆنی نێونەتەوەیی ناویان بردووە.

ئەلکسندر یاکلوفلف لە ساڵی ١٩٢٤ لەدایکبووە، وەك پیاوەکانی سەردەمی خۆی سەربازی پیادە بووە و لە شەڕی دووەمی جیهانی پلەی ئەفسەری وەرگرتووە. شوێنەواری بریندا‌ربوونی لە جەستەی لەو شەڕەدا پێوە ماوە، فەرەنسییەکان ناوی شەیتانی کێلیان لێناوە، هەروەها بە تالیرندیش ناویان بردووە. خوێندنی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی لە پەنجاکان تەواوکردووە و پلەی دکتۆرای دەوڵەتیشی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٦١ چووەتە جیهانی کرملین، لەو شوێنە پلەی بەرزی وەرگرتووە و بەرەو پێشەوە رۆیشتووە، بەڵام لە شێستەکاندا پلەی بەرزبوونەکەی وەستاوە.

ئەو راوەستانەش وەك سزایەك بووە، چونکە ئەو نارەزایی بووە لە گوشاری نیشتیمانپەروەرانی راستڕەوەکان لەسەر دەزگاکەی کرملین. پاش ئەو سزایە لەو شوێنە راکێراوە و دوایی بۆ کەنەدا وەك سەفیر دوورخراوەتەوە، لە نێوان ساڵانی ١٩٧٢ تا ١٩٨٣ ماوەتەوە، لەو ماوەیەدا بواری بووە پەیوەندی باوەڕپێکراوانەی لەگەڵ گۆرباچۆفی سەرکردەی دوایی کرملین و دامەزرێنەری سیاسەتی ریفۆرمیستی بروسترێکا و گلاسنۆست پەیداکردووە، ئەوەی شەفافییەتی سەرلەنوێ دامەزراندنەوە.

## سەرەتای ریفۆرمیستی

یەکێتی سۆڤیەت بەرەو رووخان و نەمان دەڕۆیشت، کە لە ساڵی ١٩٨٥ کۆرباچۆف سەرۆکایەتی وڵاتی وەرگرت، لە سەرکردایەتی پێویستی بە گۆڕینی زۆر هەبوو، یاکلۆفلف یەکێك بوو لە کەسە نزیکەکانی، ئەو بۆ ئەوە کاری نەکردووە سیستەمی شیوعیەت بپارێزێت، ئەو بۆ ئەوە کاری کردووە وڵاتەکەی رزگار بکات، ئەو وڵاتەی بەو شێوەیە بەو سستەمەی تووشی شەڕێکی خوێناوی دەبوو، دەبوایە ئەو رژێمە شمولیە بگۆڕێت.

لەسەردەمی شەڕی سارد ! واقیعێکی چەسپاو لای دەسەڵاتدارانی هەبووە، ئەویش بڕبڕەی پشتی سیاسییان بووە، گۆڕینی ئاسان نەبوو، بۆیە مانی رەوای ئازادی بیر و دیموکراسی و ئەخلاق هاتە پێشەوە. سەرەتای پرۆژەی ریفۆرمەکەی یاکۆڤلێفی ساڵی ١٩٨٦ بانگەوازی ئەنتلجنسیا کردبوو، ئەوەی لە پێش شۆڕشەکەی بەلشەفی ساڵی ١٩١٧ بەناوی ئەخلاق پێناسەکرابوو، دووبارە ئەوەیان بەرپرسییەتی ئەخلاقی وەرگرتەوە، لەو رۆژانەدا کەسایەتی ئۆپۆزسیونی وەک ئەندرێ زاخارۆڤ-ی ناسراو، بواری درا لە وڵات بچێتە دەرەوە، گیراوە سیاسییەکان و نەخۆشی ناو نەخۆشخانە تایبەتییەکان و شێتەکان ئازادکران، ئەلکسەندر سولجینتسین لەسەر ئەو کۆچبەرانەی دیانەوێت بێنەوە ناو یەکێتی سۆڤیەتیی نووسی. یاکۆڤلێف داوای پەیوەندی بە پاپاوە کرد، وەڵام درایەوە ئێمە بەناچاری بوارێکی نوێی لەگەڵ دەدۆزینەوە لەسەر بنەمایەت تایبەتیی مرۆڤایەتی شیاو و ناسراوی ناو بەربەرکانی چینایەتی.

ئەلکسەندر یاکۆڤلێف بە گەرمی پێشوازی لە (کای) کرد، بەبێ پێشەکی و یەکسەر زەرفێکی پێچراوی دابووە دەستی پێی وتبوو:

ئەو بوارە تەواوەم نەبوو زۆرتر لە ئەرشیفی نهێنی وەک شاهیدێک بۆ کوشتنی باپیرانی ژنەکەت بگەڕێم. بەڵام لە ئەرشیفی مێژوویدا رۆژانەی دەستخەتی داپیرم دۆزیوەتەوە، ئەو پێش شۆڕش ژنی ملحقێکی سەربازی بووە. من ناتوانم نۆژدنالەکانت بدەمێ، بەڵام کۆپیەکەی مەبەستەکەت دەپێکێت.

## ترێنە ئەفسوناوییەکە

پاش ئەوەی زەرفەکەی پچڕی و لاپەڕەکانی هەڵداوەنەوە بۆی دەرکەوتبووە ئەوەی نووسراوە رۆژانەی سەفەرنامەی تایبەتین بە ترێنی خێرای خۆرهەڵات، نابێ ئەو ترێنە ئەفسووناوییە نموونە و هێمای رۆژانی تاریکی یەکێتی ئەورووپی بێت کە سەردەمی شەڕی سارد دروستی کردبوو؟ هەروەها چەند وێنەی شاری ئەستەنبۆڵیشی تێدابوو.

کای بەو دۆزینەوەیە زۆر دڵشاد بوو، ئەو حەزی بە مانەوە نەدەکرد، ئەگەرچی مانەوەی و کەرانی زۆر شتی باشی هیوا و ویستی ئەوی دەست دەکەوت، وەک ئەوەی لۆژیکی ئەو پێناسەی کردبوون وەک کۆتایی شەڕی سارد و رووخانی دیواری بەرلین و نزیکبوونەوەی ئەورووپا خۆرهەڵاتی و خۆرئاوایی، هەتا کەسایەتی دەرچوو و نامۆ لە رۆمانەکانی دیستۆفسکی، زۆر شتی تری ترێنە خێراکەی هێمای ئەورووپای بێ سنووربوون.

کای داوای لە ئەلکسندر کردبوو، نهێنییەکانی کۆتایی شەڕی ساردی بۆ بگێڕێتەوە، پیرەمێردە زاناکە رووداوە گرنگەکانی ساڵانی نێوان ۱۹۸۹ تا ۱۹۹۱ی بۆ گێڕابۆوە. ئەو دۆسیەی بۆ ئەورووپای ناوەڕاست گرنگ بوو، ئەوانە سەعاتە یەکەمەکانی برسترویکای تێدایە، یاکوفلف بەڕووی نەیارەکانی وەستا و کۆڵی نەداوە، ئەوەش لە ئەورووپای ناوەڕاست روویداوە تا میللەتان بە مافی حکومگێرانی خۆیان گەیشتوون. یاکوفلف بۆ مەسەلەی یەکگرتنەوەی هەردوو ئەڵمانییەکە بە رووی کی جی بی و پارێزکارانی حیزب وەستاوە، کای وەک ئەڵمانییەک ئەو پرسەشی هەبوو.

لەو قۆناغەدا یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا بە مەسەلەیەکی براوە و تەواوی ناونەوە، ناکرێ ئەو مەسەلەیە دەرەنگ بکرێت و بایەخی پێنەدرێت، بۆیە سەردانی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی کردووە، ئەو بیرۆکەیەی بە کوێی بەرامبەرەکەی چرپاندووە و یەکگرتنەوەکەشی بە ئارامی هەموو ئەورووپا زانیوە.

## گۆرباچۆف لە برلین

زۆر بایەخ بە سەردانەکەی گۆرباچۆف بۆ ئەڵمانیای خۆرهەڵات لە پاییزی ۱۹۸۹ دراوە، هاوولاتییانی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی وەک کۆنە سەرۆکەکانی خۆیان پێشوازییان لە سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت کردووە، کە کەڕایەوە مۆسکۆ گۆرباچۆف بە یاکلوفلفی وتبوو:

وا باشە بۆ جێگرتنەوەی پاشماوەکانی ستالینی کۆن کەسانی تر بدۆزینەوە.

لە بەهاری ١٩٨٩ بەردەوام هەواڵگری کرملین ڕەوشە ترسناکەکەی ناو ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی بە ڕاپۆرت بە سەرۆکی سۆڤیەتی ڕادەگەیاند، لە ڕاپۆرتەکانیان هاتنە پێشەوەی ڕەوشێکیان پێشبینی کردبوو، مەسەلەکان بە ناقارێکدا دەڕۆن لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوانەوە دوورە و مەترسی پێوەیە.

کە یاکلوفلف جوان مەسەلەکەی شرۆڤەکرد، گەیشتنە ئەو ڕاستییەی یەك ڕێگا و بوار لە ئارادایە، ئەویش یەکگرتنەوەیە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پێشهاتەش پێویستی بە هێزی سەربازی سۆڤیەتی هەیە، ئەو ڕیفۆرمخوازانەی زۆر خێرا ڕەوشەکە دەبەنە پێشەوە بە سوپا و کی جی بی بە دیلی دەگیرێن. بەڵام لە شەوی هەشت لەسەر نۆی نۆڤەمبەری ١٩٨٩ دیوارەکە کونبەددرکرا، بەو هەنگاوە مێژوو بەرەو گۆڕانێکی تازە هەنگاوی برد، مەسەلەکەش تەنها پارچە هەورێك بوو و هات و ڕۆیشت.

یاکلوفلف داوای قەڵاچۆکردنی هەموو ڕەنگ و بۆنێکی بەلشەفیەتی کردووە، ئەوەش بە ڕووی (کای) کراوە، چۆن ئێوەی ئەڵمان هەرچی نازی هەبوو لە وڵاتەکەتان لەناوتانبرد!

لە ڕووسیا داوا لە دژی ڕژێمە شمولییە کۆنەکە تۆمار نەکرا، بەرپرسانی کۆنیان بە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی نەدایە دادگا، نەگەرچی ئەو لیژنەیەی یاکلوفلف سەرپەرشتی دەکرد تۆمار و داوای ٢٥ ملیۆن قوربانی ناو یەکێتی ئەورووپییان هەبوو.

## زەمەن دەڕوات

ساڵان بەسەرچوون، سەرۆك بۆتین هاتە سەرکار و کی جی بی گەیشتە قەناعەت و دامرکایەوە، ئاواش یاکلۆفلفیش بەرپرسییەتی ڕابردووی هەڵگرت. بۆیەش بە (کای)ی وتبوو:

لە کۆتاییی بە داخەوە رووخانی شیوعییەتیمان لەدەست دەرچوو.

کای ئەو چەند سەعاتەی لەگەڵی مایەوە، بە کاتێکی مێژوویی ناساندووە، چونکە لە دەڤ پیاوێکی زۆر زیرەك بووە و زیرەکییەکەی بە زیرەکی خروتشۆف شوبهاندووە. لەبەر شەوق و سەرنجی زۆر دانیشتنەکەو نزیکبوونەوەی بیر و هزری ئەو و ژنەکەی، لە بیری چوو باسی مەبەستی سەرەکی هاتنی ئەو و (ئەنا)ی ژنی بۆ مۆسکۆ بکات، کە ژنەکەی نیازیەتی مێژووی باب و باپیرانی لە رووسیای ئەمر بدۆزێتەوە. یاکلوفلفی ئەو کەسایەتییە بوو، گوزارشت لە تەقالیدە دێرینەکانی ئەو وڵاتە دەکات، کە لە چەندین بەردی گەورە و کەنیسە و کۆشکی بۆندار پێکهاتووە و بەرەو بواری کۆن و سەربردەی باپیرانەوە روو دەچێت، ئەو وڵاتەی بە ژن و پیاوەکانیەوە بنیاتنراوە، لە پۆشکینەوە تا دیستۆفسکی و لە گۆگۆلەوە تا تۆلستۆی.

## بەڵگەنامەی گرنگ

کای بە کامەرانی و سەرفرازییەوە مۆسکۆی بە کۆلێك بەڵگەنامەی گرنگەوە جێهێشت، ئەو زۆر پەرۆشی ئەوە بوو ناوەرۆکی بەڵگەنامەکان ببینێت، بەڵام مەسەلەکەی بۆ ئەنای ژنی هێشتەوە، گەڕایەوە ئەمریکا و جوانترین و باشترین دیاری بۆ ژنەکەی هێنابوو.

ژنەکەی نامەکەی وەرگرت و پچڕاندی، لەگەڵ کردنەوەی زەرفەکە وێنەکەی شکا و کەوتەوە خوارەوە، وێنەی گۆڕستانێکی گچکە بوو، کای بە دەرکەوتنی ئەو وێنەیە سەرسام بوو، چۆن یاکلوفلف ئەیوتووە ئەو زەرفە وێنەیەکیشی تێدایە. کای ژنەکەی بەگەرمی لە ئامێز دابوو کە وتبووی:

ئەو پیاوە ئەگەرچی چاوە جوانەکانتی ئەناسیووە، بەڵام بۆ ئەو چاوانەی کردووە، خۆ دەیتوانی ئەو بەڵگەنامانەمان نیشان نەدات.

لە پشتەوەی وێنەکە پیتی (ئا) و پیتی (ت) جوان دیاربوون، بەڵام پیتی سێیەمەکە نەدەخوێندرایەوە، وێنەکە نیمزای بە پیتی (ئا) و بە پیتی (ن)ی لەسەربوو، ئەو رۆژە بەردەوام ئەو ژن و مێردە خەریکی خوێندنەوەی رۆژانەکەی

تۆماری داپیری ئەنابوون، لەناو بیرەوەرییەکەدا بەدەستخەتی خۆی چەندین هێلکاری شاری ئەستنبۆڵیشی تێدابوو. شەڕی یەکەمی جیهانی تەواوبوو، کەسوکاری ئەو ژن و مێردە ئێستاش نەیانزانی ئەوانە لە کوێ مردن، لەکام شار مردن لە ئەستەنبوڵ، لە پراگ لە بودابست؟؟

بە ڕێکەوت ئەو ژن و مێردە گەنجە بە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات بۆ بەسەربردنی پشوودانەکەیان سەفەریان کرد، هەموو کەرەستە و پێویستییەکانیان تێکنا، کتێبی جوانیان لەسەر ئەو شارانە کڕی کە ترێنەکە بەناویاندا ڕەتدەبێت، هەرچی کتێبی کەسایەتی ناوداری ناوچەکەش هەبوو، قۆناخ بە قۆناخ هەڵیانبژارد، بۆ نموونە شا ڕۆدولف بۆ شاری پراگ و دامەزرێنەری بالیەکان و دیاکیلاف بۆ شاری ڤینیسیا، بۆ ڕەمزی شاری قوستەنتینیەش زۆر دانووستانیان کرد، کێ ڕەمزی ئەو شارە بێت، سوڵتان عبدالحمید. لێودشاوەیە بۆ نیشانە و پێناسەی ئەو شارە کۆنە؟؟ زۆریان هەڵبژارد وەک ماتا هاری و لورنسی عەرەب و ئاجاتا کریستی؟؟

## گەشتی یەکەمی ترێنەکە

لە ڕۆژانی پێش سەفەرەکەیان ئەنا زۆر بە قووڵی لە بیرەوەرییەکانی داپیرە وردبۆوە، ڕۆژی کردنەوەی هێڵی ترێنەکە لە ساڵی ١٨٨٣ بوو، باپیری ئەنا دیپلۆماتی یەکەمی رووسیا بووە لە پاریس، لەو دەمەدا وەک ملحقی سەربازی بۆ قوستەنتینیە گوازراوەتەوە، تا بگاتە شوێنی نوێی کاری بەهاوڕێیەتی چەندین سیاسی و ڕۆژنامەنووس و کەسایەتی بەو ترێنە بەڕێکەوتووە.

## ئوکتۆبەر ١٨٨٣

پاش گەشتێکی تایبەتی بەو ترێنە، بەرەو ئارامی دەڕۆیشتین، پێویستە ئاماژە بەو بکرێت فارگۆنەکانی نووستن زۆر جوان ڕێکخرابوون. بە ئوتومبێل جانتاکانیان لە پاریسەوە بۆ ناو ترێنەکە بردین، بەبێ ئەوەی بیرمان لەلای جانتاکانمان بێت، لە ماڵە

نوێیەکەمان لە قوستەنتینیە وەرمانگرتنەوە. وەك چۆن لە رۆژنامەی لۆفیگارۆ نووسراوە:

لە رۆژانی پێشوودانەکانمان جاران دەچووینە دارستانی ناعورە شینەکان، یان دەچووینە بەندەرە نزیکەکانی مانش، بەلام ئیسرۆ دەچینە شاری ئەستەنبۆل! لە ئێستگەی ستراسبۆرگەوە بەرێکەوتین، لە رۆژی ٤ ی ئوکتۆبەر لە سەعات حەوت و نیوی ئێوارەدا، ئێمە زۆرتر لە ٣٠٠٠ کم واتە بەچوون و بە هاتنەوەمان ٦٤٠٠ کم - مان لە هەفتەیەك کەمتر بڕیبوو، ئەوەش نیشانەی پێشکەوتن و کەرەستەی تازە و سەردەمانەوە بووە، بەراستی شتێکی جوان و باشە.

ترێنە خێراکەی خۆرهەلات دوو فارگۆنی خزمەتگوزاری تێدابوو، یەکێکیان هۆڵێکی خواردنی گەورە و کتێبخانە و ژووری ژنان و نووسینگە و چێشتخانەیە، ئەوەیان نوێ و چاکە، ژیان لەناو ئەو ترێنە نوێیە وەك ژیانی ناو کۆشکەکانە.

لەگەڵ بەرێکەوتنی ترێنەکە، بەرێز نجلماکرس داوەتێکی ئێوارەی بۆ سازکردین، خواردنەکان بە لێزانی و سەرپەرشتی چێشتلێنەری شارەزابوو، لیستی خواردنەکان نایاب بوون، ناوی خواردنی دەریایی و هەویرکاری ئیتالی و مەردگە و مریشك و گۆشتی گا و شوکولاتە و کریمی شوکولاتە و مێوەی جۆراوجۆر هاتبوو، بەو داوەتە هەمەجۆرە زانیمان ئەو ترێنە چۆن بوویتە سالۆنێکی راستەقینەی پلەداری نایاب، ئەو ترێنە بوویتە وەسیلەیەکی باش و خێرای گەیشتنی باش و چاك و هەموو پێداویستەکانیشی لەخۆکرتووە. ئەو هەستەمان زوو لا گەلاڵەبوو، بە دوان و ناخاوتن و رێزکرتن و جۆری خواردەمەنییەکان و رووناکی جوانی فانوسەکان .. بەو شێوەیە هەموو خاکی ئەورووپامان بڕی. لەو رێگایە دووردا لە هەموو خاڵێکی سەرسنوورەکان قاتیرەی فارکۆنەکانمان دەگۆڕی، بۆ برینی ئەلب پێویستمان بە دوو قاتیرەی تریش هەبوو، یەکێکیان بۆ پێشەوە و ئەوی تریان بۆ پاشەوە، دیارە ئەو ترێنە بارەکەی لە ١٠١ تۆن زۆرتر نەبوو.

## لە هەنگاریادا

لەناو خاکی ئەڵمانیادا بەردەوام دەستی گەرمی پێشوازی بۆ ئەرەنسییەکان درێژ دەکرا، ڕێگاکەی ناو هەنگاریامان خۆش بڕی، ئێستگەکان خۆش و جوان بوون، دەروازەکان چاك رازابوونەوە، لەو ڕێگایەدا خانووی یەك نهۆمان بینی. کەلای قەزەچ درێژمان هاتە پێش، بە درێژایی ڕێگا ڕەنگی جوانمان دەبینی، لەناو ئورپا سێ پیاومان بینی پێڵاوی گەورەی تایبەتیان لەپێدا بوو، خەڵکی ئەو ناوچانە ئەو ڕەوشەدا دەژین، باران زۆرە و هاووڵاتییان پێڵاوی وایان پێویستە، لەو ناوچەیە بەفر زۆر دەبارێت و ئاسۆکە سپی دەکات.

لە (زەگەد) کاروانێکی ڕکوکزی هاتنە پێشوازیمان. کاروانەکە درێژبوو، بە تەواوبوونی ترێنەکەش ئامادەبووان زۆربوون، دیاربوو بۆ هاتن و گەیشتنی ئانکی ڕۆمانی وەستابوون. ئاهەنگەکە سێ سەعاتی خایاند، ئجاکرس بەو دیمەنە سەرەتا سەرسام بوو، دوایی بزدیەکی خۆشی لەگەڵ ڕیشە ڕەشەکەی ئاوێتە بوو، ئەو ئاودیەش مایەنەوە کاتێکی خۆشمان ڕابوارد.

## ئامانجی ترێنەکە

ڕێگاکەی گەیشتن بە ئەستەنبۆڵ کاری تێدامابوو، بۆیە لە بوخارست ڕاوەستاین، ئاوەکەمان بە پاپۆرێك بۆ بولگاریا بڕی، لەوێ ترێنێکی تر ڕاوەستابوو، ئیسەی گەیاندە سەرکەناری دەریای ڕەش. تا گەیشتنە دوا قۆناخ تەکەرەی زۆرمان هاتە پێش، کە گەیشتینە لای پردەکە خەڵکمان بە لێشاو بینی، خەڵکێکی زۆرمان بینی لەسەر ڕێگاکان خەویان لێکەوتبوو. کە خۆر هەڵات سەرنشینەکانی ترێنەکە تا بوار وەربگرن لە بسفۆر بپەڕنەوە زوو بۆ لای پردەکە ڕۆیشتن. لەو ڕۆژەوە و تا ئیمڕۆش (ئەنا) پەرۆشە بەو ترێنە بگاتە قوستەنتینیە و ئەو شارە ببینێت، ئەو شارەی ئیمڕۆ ناوی ئەستەنبۆڵە.

# گەیشتن بۆ تورکیا

ئەنا و کای ئەمجارە بە فرۆکە گەیشتنە ئەستنبۆڵ، پرۆسەی گێڕانەوەی مێژووە، رووبەڕووی یادکاردکانی مێژوو بوونەوە، وەک چارەنووسی پیاوەکان، رووخانی ئیمپراتۆریەتەکە، وێنەی ئەخشینی چەندین شوێن، بەرزاییەکەی بیرا و کۆشکی هەزار و یەك شەو و بیرا پلاس و هوتێلی ئەفسوناوی خۆرهەلاتییە خێراکە .. هەموو ئەو شوێنە خۆشانە. ئەنا وتی:

ئێوارانی بەهاردکە ناو و هەواکەی خۆش بوو، ئەو خۆشییە لە رەنگەکان دەبینرا، هەموو بەیەکەوە دیمەنی تەریب و تەواوکەری یەکتریان دەنواند، هەموو شتەکان جوان و نایاب بوون، وەك کەوڵەکەی ئەناتۆلی و چا و دەیان جەمی تایبەت بە خواردنی عوسمانییەکان و فانۆسی هەڵواسراو و زەنجیری درێژ و رووکاری ئەخشین بە زیو و مەڕمەر و کاشی.

ژووردکانی بیرا پلاس ١٠٦ ژووربوون، لەوێ خەونەکانی ئەتاتۆرك بەرجەستەبوون، ژووری ژمارە ١٠١ مۆزەخانەیەکی تایبەتەو لەسەر شەرەفی ئەتاتۆرکی دامەزرێنەری تورکیای نوێ بوو، ئەوەی کە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەناوبردووە. ئەو ئەفسەرە نازابوو، ویستی تورکیا بکاتە وڵاتێکی ئەورووپی، تا بڕیاری دا ژنانی تورکی بۆیان نەبێت پەچە هەڵگرن، فەرمانی دا ژنانی سۆزانی دەبێ پەچە بپۆشن، نابێ روویان بە دەرەوە بێت، کە سۆزانییەکان سەرپۆش بوون، ژنانی تر لە ترسی خۆیان پەچەکانیان فڕێدا.

بیرا پلاس بۆ مێوانی ترێنە خێراکەی خۆرهەلات تارمایی و سەرسوڕهێنەربوو، وەك بیێر لۆتی و ماتا هاری و ئەجاتا کریستی و سارە برنارديت و گریتا گاربۆ...

کای و ئەنا ژووری ژمارە ١١٤یان وەرگرت، زووتر ئەجاتا کریستییش لە سەفەرەکەی بۆ ئەو شارە هەمان ژووری وەرگرتبوو، ئەوەی نهێنی و تەلیسمەکانی زۆر کەس و سیحرباز و سیناریستیشی سەرسامکردبوو.

# دواکەوتن

لە ساڵی ١٩٢٦ ڕۆماننووسەکە لە سەردانەکەی بۆ ئەستەنبۆڵ ١١ ڕۆژ دیار نەما، ئەگەرچی هەموو لایەکی سەرسام و نیگەران کردبوو؛ بەڵام ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی ڕاستی شوێنەکە و هۆکاری خۆشاردنەوە و گومبوونەکەی بەکەس نەڵێت، ئەوەی زانرا گوایە بۆ دۆزینەوەی مردوویەک پێویستی بە کلیلێک بووە، درێژییەکەی هەشت سانتیمەتر بووە، لە دیواری ئەو ژوورە شاردراوەتەوە و خەونی بیرا پلاس شوێنەکەی دەزانی، بەڵام ئەویش وتویەتی، ئەو کە شوێنەکەی کڕیوە دەستکاری کردووە، بۆیەش سووربوو لەسەر ئەوەی ڕووداوی فیلمەکەی لەو شوێنە و لە شەقامەکانی ئەو شارە وێنە بگیرێت، ئەو شارەی حەوت بەرزایی دەوری گرتووە و چەندین مزگەوتی تێدایە، تەنا جارێک کەشتەکەی کیرارد دۆنرفالب بەبیر هاتەوە، کە ئەستەنبۆڵ ناوی قوستەنتینیە بووە.

لەناو ئەو ترێنەدا رێبواران زۆریان ئەو رستەیان بیستووە، ئەگەر لە سامان دەگەڕێیت سەردانی وڵاتی هیند بکەن، ئەگەر لە زانست دەگەڕێت برۆ بۆ ئەورووپا، ئەگەر دەتەوێت جوانیەکانی ئیپمراتۆریەت ببینیت لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی بگەڕێ.

ئەفسانە ناکرێ ببێتە مێژوو، بەڵام دەبێتە بنکەی مێژوو. ئەو قوستەنتینەیەی ناوی بە ئەستەنبوڵ گۆڕاوە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بووە، لە ماوەی چوار سەدە زۆر لە وێنەی ئەو شارە رووتێندرایەوە، بەڵام وەك پایتەختێکی سەیر هەر مایەوە، ئەو شارە بە بازاڕ و چیرۆکە میللییە کۆمیدیاکانی سەر سوڵتانەکانی عوسمانی مایەوە. لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەهەم بادیشانی (پاشای گەورە) یان (سوڵتانی کەورەتر) لە ژینێکی خۆشی سەرفرازی زۆرەوە ژیابوون، قوستەنتینیە ئەو دەمانە کەورەترین و جوانترین شاری جیهان بووە، بنکەیەکی سەرەکی سیاسی و رۆشنبیری و بازاڕێکی کاری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و بەلقان بووە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە جوگرافییەکەی و ناسنامەی نیشتیمانییەکەی دیارو ناسراو نەبوو، بەڵکو بە ئاست و سروشتی ئەو دەوڵەتانەی سوڵتانەکان بەڕێوەیان بردووە، بەو ترێنی خێراکەی خۆرهەڵات، ئەوەی بەشێکی ئەو ناوچانەی تەی کردووە ناسرابووە.

هاووڵاتییانی ئیمپراتۆرییەتەکە بە عوسمانی دەناسران، زۆربەیان شانازییان بە شکۆ و دێرینی ئیمپراتۆرییەتییەکە دەکرد، لە سەدەکانی ناوەندا ماڵباتی عوسمانی سەرکردەی لێوەشاوی باشیان پێشکەش بە ئەورووپاو ئەسیا کردبوو، ئەو دەمانە ئەوەی بوربون و هابسبۆرگ ئەمیری پلە دوو بوون. سوڵتان هەموو دەستەڵاتەکانی بەکارهێناوە، ئەوان تەنها سوڵتانێك نەبوون، ئەوان خەلیفە و خزمەتکاری مەزارە پیرۆزەکان بوون، پاسەوانی پاشماوەکانی پێغەمبەر و سەحابەکانیش بوون. ئەوانەش ئیمرۆ لە کۆشکی توبکابی کۆنترین شوێنی نێشتەجێبوونیان پارێزراون.

## بنكه نوێیەكە

ماوەیەكی كورت بوو ئەو ترێنە خێرایە كەوتبووە كار، دەستەلاّتداران كۆشكی توبكابیان جێهێشتبوو و لەسەر بوسفۆر كۆشكێكی تریان دروستكردبوو، لە، كۆشكەدا نەخشەی ئیتالیان بەكارهێناوە. گواستنەوەیان بۆ ئەو كۆشكە ئەورووپییە نیشانەی گەورەیی و پەلەبەرزی ئیمپراتۆرییەتییەكە بوو. وەزیر كە كەسی دووەم بووە لەو دەستەلاّتە ئەویش بۆ شكۆی سولّتان كرنۆشی بردووە، بەهەموو شێوەیەك ژیان و دەستەلاّت و ئەتكێتەكانی رۆژانەیان ئەوەندە بە شكۆ و پایەداربووە لە ئەورووپاش وێنەی كەم بووە. داپیرەی ئەنا لە رۆژانەكەی خۆیدا نووسیبووی:

دانیشتبووی ئەستەنبۆڵ موسڵمانی هەموو پارچەیەكی ئەو جیهانەی تێدابوو، لە ناوچەی جیاوازی ئەو جیهانەوە هاتبوون، بە چەندین زمان ناخاوتنیان كردووە، هیچ شتێ لەو شارە نامۆ نەبووە چونكە لەو شارە و لەو سەردەمەدا هەموو شتێكی تێدابوو.

## دووڕیان

قوستەنتینیەش وەك ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە دووڕیانی رێگاكان بوو، ئەورووپا بە ئیسلام و دوێنێ و دوارۆژەكەی سەرقالبوو. ئەو ترێنە خێرایە ئەگەرچی نێوان پایتەختەكەی عوسمانی و ئەورووپای بەیەكتری گرێ دابوو، لە لایەكی ترەوە بازاری بۆگەنی و بەدرەوشتی و بازرگانی كۆیلە (سلیڤ) لە زۆر شوێندا زۆر بەربلاّوببوو.

مۆدەكانی پاریس و ڤیینا هەنگاوی پێشكەوتنی زۆری بریبوو، ئەو جلە تازانە جێگەی جلوبەرگی تەقلیدی قۆقازی و بەلقانی گرتبۆوە، توركەكان هێشتا مێزەرو جلە كۆنەكانیان لەبەربوو، ئەوانی تر كلاّولەسەربوون. لەو ئیمپراتۆرییەتە ٥ رۆژمێر بەكاردەهات، یەكێكیان تایبەت بوو بەو موسڵمانەی لە ژێر حوكمی بابی عالیدا بوون (ناوی نووسینگەی وەزیرەكان بوو تا رووخانی ئیمپراتۆرییەتییەكە)، رۆژمێری

کریستیانی کۆنیش لەلایەن ارپوژکسیون خۆرهەڵاتییەکان و ئەرمینییەکان و رۆژمێری تازەکەی ئەورووپییەکان و رۆژمێری کاسۆلیکییەکانی ناوچەییەکان و دوا رۆژمێریش تایبەت بوو بە جولەکەکان.

## گۆڕینی ترێنەکە

رێبوارانی ئەو ترێنە هەستیان بەوە کردبوو، کەوا رەوشی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی گۆڕاوە، لەلایەکی ترەوە (ئەنا) کۆششی زۆری کرد تا بیسلمێنێت کەوا ململانێی رووسی تورکی نوێیە. لە ئەپریلی ساڵی ١٨٧٧ لەشکری رووسی لە دووری ١٦ کم دوور لە ئەستەنبۆڵ دایکوتابوو، زەبری لە قۆقازییەکان و بەلقانەکان دابوو، لەو سەردەمەشدا سوریا لە کولاّندابوو، هەموو هەستیان بە لاوازی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کردبوو، تا رووسەکان زۆرتر پێشرەوی نەکەن، ئینگلیزەکان ویستیان رزگاری بکەن. بەپێی رێککەوتننامەی بەرلین و رێککەوتنەکەی ئەپریلی ١٨٧٨ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ناچارکرا ئەملاکەکانی لە ئەورووپا تا نیوەی کەم بکاتەوە، هەرێمەکانی ئەنادۆلی دا بە رووسیا و قوبرسیشی دایە بەریتانی مەزن، پاش ئەو دابڕینە و بە لاری و نارەزایی لەندەن و پاریس لە سانت پترسبۆرگ، لەبەر سەرقالی ئەورووپا بە یەکسانی و هاوکێشەی هێزەکان، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی وەك هێزێکی مەزن لە خۆرهەلاّت و بەلقان مایەوە. ئەوەبوو لەو سەردەمەدا بە ئاسانی لەیەکتری هەڵنەوەشایەوە. ترێنی خێراکە بەپێی ئەو رووداوانە فاکتەری گرنگ بوو لەو ململانێیە جیوسیاسییەی ناوچەکانی ژێر دەستەلاّتی پاشا عبدالحمیدی دووەم.

بە بۆنەی کردنەوەی ئەو ترێنە ئەفسوناوییە سوڵتان بواری بۆ رەخسا دەستەلاّتەکەی بە شکۆوە بناسێتەوە، لەپێش کۆبوونەوەی سیناتۆر و نوێنەرەکانا دووپاتیکردەوە لە جیاتی رازیبوونی لەسەر ریفۆرمەکانی جێگەی باس، من راستەوخۆ لەسەر هەموو لایەك دەیچەسپێنم، ئەوەش لەبەر ئەوەیە من خەلیفەی راسپێردراوی خودام، بەوەش میللەتانی ئیمپراتۆریەکەم پێش دەکەون.

## کەسایەتییە بەهێزەکە،

کەسایەتی سوڵتان عبدالحمید بەڕاستی کەسایەتییەکی بەهێزبووە، توانی ئەودیەك بە چاکی حوکم بکات. لە هەمبەر خۆرهەڵاتناسان و ئەورووپییەکان زۆر وریای ناو و ناوبانگی خۆی بوو، بە پێچەوانەی پاشاکانی پێشووتری پێشوازی دەکردن، لە شوێنە گشتییەکانیش دەردەکەوت. زۆر لە گەشتەکانی ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات شایەدی بۆ **پیاوچاکی و جوامێری** و هەستی ناسکی توانای زۆری بۆ ناسینی پیاودکان و داماڵینی **بیروبۆچوونەکانی** و ڕەوشتە جوانەکانی ئەویان داوە، هەموو شتەکانی پێچەوانەی ئەوانی تر بووە.

ئەمیر و شازادەی ئەڵمانی (گیلۆم) زۆرجار لەگەڵ سوڵتان نانی ئێوارانی خواردووە و یاری بیانۆی لەگەڵ یەکێك لە کورەکانی کردووە، دیدارەکەی بە جوانترین و ناسکترین دیداربووە لەگەڵ ئەمیرێکی **بێگانە**. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی زۆر مەجبووری بەریتانی مەزن بوو، **ژنی سەفیری بەریتانی** زاری بۆ هەر شتێك کردبوایە، داوای هەرچی کردبایە **بۆیان جێبەجێ دەکرد**. لەبەرئەوەی حەزی بە گۆشتی گێشکە و **نانی گەرم و شیربووە، بۆیە بۆ گۆشت خواردنەکەی** ٣٠ قەفەس چۆلەکەیان بۆ دانابوو، **فڕنەکەی سوڵتانیش نانی گەرمی بەردەوامی بۆ** دەنارد، تا شیری باشیش بەردەوام **بخواتەوە**، سێ **مانگای شیردەریان بۆ** ناردبوو. سوڵتانەکانی ئەو سەردەمە هەموو وابوون، خاوەن دوو کەسایەتی بوون، **خۆیان** وەك کەسێکی هاوچەرخ و شارستان ناساندووە، لە دیوی دووەمیشیان **وەك کەسێکی** بەترس و بەسام خۆیان دەرهێناوە، بەڵام پاپۆرێکی جەنگی بەریتانی لەناو دەریا بۆ چاودێری و پاراستنی لەلایەن سەفیرەوە بەردەوام ئامادەبووە، بە نزیکبوونەوەی دبلۆماسەکان پاپۆرەکە دووركەوتیتەوە.

# ترس و گومان

سولتّان عبدالحمید زۆر ترساوە بەردەوام دەمانچەیەکی گڕداری بە فیشەکی لەنزیك بووە، لە ترسانا نەوێراوە توخنی هەموو شتێك بکەوێت، کۆشك و سەراکانی بە پاسەوانی وردەوە پارێزکاری کراوە. توێژە دەستەڵاتدارەکە گومانیان هەبووە، کەسیان بواری ئەوەیان نەدراوە لەگەڵ بێگانەیەك کۆببێتەوە، ئێوارەخوانێك بەیەکەوە سازبکەن، سولتّان لە لەشکرەکەی خۆشی ترساوە، بواری مەشقی گەورە و مەناوەرەی نەداون، کۆبوونەوەی ژمارەی زۆری چەکدار قەدەغەبووە. ترس و گومان لە ناکاری نیشتبوو، لە هەموو شت ترسابوو، ئەگەرچی زۆر دۆزینەوە تازەکانی ئەورووپا و کەرەستە نایابەکانی زۆر بە دڵ بووە، حەزی لە کامێراش کردووە، هەر لە ترسەوە لە تەکنەلۆژیاش دووردەکەتەوە، بڕوا و متمانەی بە کارەبا نەبووە، بۆیە لە ئەستەنبۆڵ بێجگە لە نەخۆشخانە و سەفارەتەکان و کۆشکەکانی خۆی نەبێت لە هەموو شوێنێك بەکارهێنانی کارەبا قەدەغەبووە. ترس و گومانەکەی بە قسەی خۆی خۆشەویستی بۆ مەملەکەتی بووە، نەیویستووە چارەنووسی وەك ئەوانی تر بێت. هەموو دەستەڵاتەکانی کۆکردیتەوە لای خۆی، کەسی لە بن دەست نەبووە، کار و فەرمانەکانی هەمووی لە بن دەستی خۆی گلداوەتەوە، بۆیە زۆریان دوادەکەوت، یان هەر گوم دەبوون. چینە پایەدارەکانیش هەستیان بە مەرگ و کابوسی مەملەکەتەکە کردبوو.

داپیرەی (نەنا)ش ئەرمەنی بووە، بە تاوانی ئەوەی دۆستی تەقلیدی رووسیان، لەو سەردەمدا ئەرمەنیەکانیش زۆر لاواز و شەکەت کرابوون، ئەوانەی لەو مەملەکەتەش مابوو بە زۆری لە ئەستەنبۆڵی خۆرهەلاتی دەژیان، ئەوانیش خەونی سەربەخۆییان هەبوو.

## لەناوبردنی ئەرمەنەكان

سوڵتان بە هەزارەها ئەرمەنی لەناوبردووە، زۆر دڵڕەقانە و بە توندی پرۆسەكەی ئەنجامداوە، قەڵاچۆكردنەی زۆر بە دژواری بووە، بۆیە ناوبانگی ئەو لەسەر هەموو ئیمپراتۆرییەتەكە چەسپاوە و لەبیر ناكرێت. كۆشكی ئەو ٣٠ساڵ مەڵبەندی جیهانی بووە، ئەو كۆشكەی لەسەر سنووری ئەستەنبۆڵ لە چەندین هۆڵی بڵاو و گەورە دروستكردووە، جاران لایەنی فرۆشگایەك بووە، لە ساڵی ١٨٣٠ دەستكراوە بە دروستكردنی و لە ساڵی ١٨٧٧ سوڵتان عبدالحمید تەواوی كردووە.

## سوڵتان و داروودەستەكەی

یلدز بووە شارێكی گچكە، لەناو ئەو شارەدا سوڵتان بە چەندین پاسەوانی عەرەب و ئەلبان دەپارێزرا، دیارە لە پاسەوانانی تورك دڵنیانەبووە. سوڵتان ١٥٠٠ پاسەوان و ٢٠٠٠ خزمەتكاری هەبووە، هەموویان لەو شوێنەدا دەژیان، بۆ چاودێری تەندروستیشی دكتۆرێكی كریستیانی دانابوو. شوێنی تایبەتی دانیشتنی كاروباری دەوڵەتی تایبەتی هەبووە، لەو كۆشكەدا چەندین ساڵۆنی پێشوازی بەناوی ئەستێرە هەبووە، شوێنە تایبەتییەكەی سوڵتانیش لە نێواندا بووە. ئەو شوێنە بە مەڕمەڕی تایبەتی دروستكراوە، لەوێ دیاری و قاوە بە والی و دەستەڵاتداران و برادەرەكانی پێشكەشكراوە، هەر لەو كۆشكەدا پەردەی شانۆكەی بەتەواوكردنی نانی نیوارەكەی دەكرایەوە و نمایشی فەرەنسی و پێشبڕكێی توركی تێداكراوە، هەروەها كتێبخانە و روانگە و خوێندنگای ئەمیرەكان و باخچە و گەرماو و مۆزەخانە و ساڵۆنی تابلۆ و دوو مزگەوت و چوار تەویلەی ئەسپی عەرەبی رەسەن و چەند وەرشە و مۆنگەی سەربازی و هەروەها حەرەمیشی تێدابووە.

## کۆشکە ئیتالییەکە

ئەندازیار و رەنگرێژەکەی سولتان ئیتالی بووە، بۆیە ناوی کۆشکە بە ئیتالی ناوی رۆیشتووە، دیکۆرەکانی عوسمانی ئیتالی بووە، رووبەری باخچەکانی چواردەورەی ٥٠ هکتاربووە، جۆرەها رووەك و گیاوگوڵی دەگمەنی تیّدا چاندرابوو. رێبوارە یەکەمەکانی ترێنە خێراکەی بە دیتنی ئەو کۆشکە راگەیشتن، ئەو دەمە سکرتارییەتی ئیمپراتۆرییەتی تێدابووە، لەو کۆشکەش وەك کۆشکە نایابەکانی ئەورووپی کەسانی ئەندام رێك و جوان پۆشتە بۆیان هەبوو لەو کۆشکە بێنە ژوورەوە، نووسەرانی کارمەندیش لە هۆلەکانا سەرقالی کاری خۆیان بوون، خواردن و قاوەش بە زۆری بۆنی هاتووە، کەس بیری لەوە نەکردیتەوە مێزی نووسین بەکاربهێنێت، ئێمە بە پێلاوەوە بەسەر شوێنەکاندا دەرۆیشتن، ئەوانیش بە پێخواسی دوور دانیشتبوون، هەندێکیان شانیان دابووە ئەرزەکە و بە دەستی لەناو قاپەکانی سەر مێزەکان خواردنیان دەخوارد. لەو شوێنەدا کێشەی زۆری نێوان سولتان و پارێزگاران و ژەنرالەکان و سەفیرەکان دەکرا، زۆریش لە جاسووسە خزمەتکارەکان راپۆرتی خۆیان دەنووسی و رەوانەیان کردووە.

## ئاهەنگەکانی سەفیرەکە

باپیری (ئەنا) سەفیری بە پلە وەزیری رووسی بووە لە قوستەنتینیە. لەبەرئەوەی حەوت ساڵ لەوێ کاریکردووە بۆیە زۆر شارەزای کون وکەلەبەنەکانی ببوو، ئەو بەسەری تاشراو و جلوبەرگی نەخشکراو یەکێك بووە لە کەسە ناسراوەکانی کەرەکەکانی بیراو بیوقلۆ. بە زەوق و ئامادەیی ئەو سەفارەتە دەستی بە ئاهەنگەکانی کردەوە، دیارە ئەوانەش بۆ ئەوە بوو تا خۆیان لە رەوشە مێژووییە تازەکان و پێشهاتەکان دوور راگرن. لەو ئاهەنگانەدا شمپانیا فرِدەکرا و دووکەڵی جگەرەش بەرزدەبۆوە، ئەو حەزی لە خۆشیەکانی خۆرهەلات بوایە، بەو دووکەڵە نیگەران

نەدەبوو، خێزانە دبلۆماتەکانیش ئارەزوویان بووە، دوا مۆدەی جلوبەرگیش نمایش بکەن، بۆ پرۆپاگەندەش نیشان دەدرا.

لە یەکێك لە گەشتەکانی بەو ترێنە، بەرپرسانی حەزیان کردبوو دیکۆرێکی تایبەت بۆ فارگۆنی چێشتخانەکەیان رێکبخەن. فارکۆنەکەیان بە مۆمی بۆن خۆش و روناکی گوڵی ئاسك وەك پیستی ژنانی ئاسك رازاندبۆوە.

## شۆڕشی گەنجان

ئامادەبوونی ئەمیرە پلە یەکەمەکانی وەك خدێوی میسر و ئەمیری بولگاریا و ناوچەکان بۆ ئەوەبوو شان و شەوکەتی ئیمپراتۆرییەتەکە نیشان بدات، بە میوانەکان بڵێت ئێمە هێشتا لەسەر ئاستی جیهانین. لە یولیوی ساڵی ١٩٠٨ سوڵتان بەڵێنی بە گەنجانی تورك دا گۆڕان بکات و سەردەمی زۆرتر ئازادی و خۆشگوزەرانی بێتە ئاراوە. لەو سەردەمەدا باپیرانی ئەنا بە ترێنە خۆشەویستەکەیان لە ئەستەنبۆڵ دەرکەوتن، لەمێژبوو نیازی ئەو سەفەرەیان بەو ترێنە هەبوو، بەڵام کەوتنی بەفرێکی زۆر رێگاکانی بەرەو تورکیا گرتبوو، ئەوان بەردەوام سەفەریان هەبووە و گەڕاونەتەوە، هەر جارێك کە گەڕاونەتەوە وڵات و سوڵتانیان بە لاوازتر دیوە، روحی ئیمپراتۆرییەتییەکەیان بەرەو رووخان هەستپێکردووە.

## حەرەمی سوڵتانەکان

باهۆزی شارستانیەتی تا ماوەیەکی زۆر درێژ نەگەیشتە شوێنە پیرۆزەکان، شوێنی حەرەم وەك خوێندنگای مەشرقی پیاوانە نەبوو، حەرەم وشەی پیرۆزی بۆ بەکارهاتووە بە عەرەبی واتە قەدەغە و پیرۆز و کەس بۆی نەبوو بێتە حەرەمەکانی سوڵتانەکانی عوسمانی. شوێنی ژنانەی سوڵتانەکان ئەوەی هاموشۆی کردبایە هاتوچۆ و پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە نەدەما، بەیەکجاری لە دەرەوە دابڕاوە، بۆیان نەبووە ناوێتە جیهانی سروشتی بن، ژیانی ئاسانی لەو کارمەندانەی ناو حەرەم نەدەما، ئەوانیش

لایان ئاسایی بووە، ئەوانەی لەو شوێنە قەدەغانە کاریانکردووە زۆریان لە منداڵییەوە لەو کۆشکە ژیان و نەهاتوونەتە دەرەوە، پەیوەندییان بە جیهانی دەرەوە نەبووە، زۆربەیان بە رەچەڵەك بێگانە بووینەو لە دەرەوە هاتوون، کەسیان هاووڵاتی رەسەنی ئەو وڵاتە نەبوون.

## نزیکبوونەوە بە کۆیلە (سلیڤ)

تا شەوکەتی قوستەنتینیە شکۆدار نیشان بدرێت، لێشاوێکی زۆری سلیڤ و خزمەتکار روویان لەو ناوچە خۆرهەڵاتییەکردووە، بە ئارەزووی خۆیانەوە و بە رەزامەندی ماڵباتەکانیانەوە جوانترین مێینەی پیستە شیرینی جوانی قەوقازی دەهاتن، کرین و هاتنی ئەوانە زۆربوو، بۆ نموونە شای فارس لە گەشتێکی بۆ وڵاتی رووسیا داوای لە سەفیرەکەی لە قوستەنتینیە کردووە، بە زووترین کات دوو کیژە قەوقازی جوانی بۆ بکرێت و بۆی رەوانە بکات، تا ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەم ئەو دیاردەیە زۆر بە ترسناکی هەبووە، بەڵام بە نزیکبوونەوەی ئەو وڵاتانە لە ئەورووپا ئەو دیاردەیە نەماوە. دابونەریتەکانی عوسمانی ناوچەیەکی فراوانی گرتیتەوە، ئەوەش جیاوازی زۆری نێوان ئەورووپا و عوسمانییەکانە. بەپێی تۆمارەکانی ساڵی ١٩٠٠ دەرکەوتووە ٤٠٠ تا ٥٠٠ ژنە خزمەتکاری قەوقازی خزمەتی ماڵی ئیمپراتۆری لە بازنەیەکی داخراو کردووە، ئەوانە دوو زاراوەی تایبەتی نێود قەوقازی و تورکیان هەبووە، شێوەی چێشتلێنانی تایبەتییان هەبووە، بە راگەیاندنی پەیدابوونی کۆماری تورکیا نەماون.

## ئۆرکسترای ژنانە

حەرەمی عوسمانیش ئۆرکسترای ژنانەی خۆیان هەبووە. ئەندامانی ئەو تیپە جلی تایبەتی قەدیفەی سووریان لەبەرکردووە، ئەو تیپەش هاوشانی تیپەکەی پیاوانان بووە، ئەوانیش بە باشی پارچە مۆسیقای نوێەرێتی ئەورووپی تورکی هاوچەرخیان

ژەنیوە. ژنانی حەریم جیهانی زۆر تایبەتیان هەبووە، ئەو ژنانە بێجگە لە سوڵتان یان کەسانی زۆر نزیکی ئەویان نەبینیووە، ئەگەر پێویست بە دیتنی پیاوانی تر بوایە، ئەوە لە پشتی پەردەوە بووە، ئەگەر بەشداری ئاهەنگی کۆشکیان کردبوایە لایەکی تایبەتیان بۆ حەریمەکان تەرخانکردووە و لەوێیەوە تەماشای ئاهەنگەکەیان کردووە.

## خەسیووەکان

**ئیمپراتۆرییەتەکە،** به شەرع و بە فیزیولۆجی ناکرێ خەسی و ئیماو لە دەرەوەی **دادگا پەیوەندی بکەن، ئەوان بۆیان هەیە** پەیوەندی بە کەسانێك بکەن راستەوخۆی هیچ پەیوەندییان بە کۆشکەوە نەبێت. کۆشکی سوڵتان نوای ئارامی خێزانی ئەوان بووە، سەربەرزبوون بەوەی لەناو خێزانی تایبەتی سوڵتان ئەوان ئازادانە هاتوچۆیان بووە. پەیوەندیشیان بە سوڵتان و گەورەی ماڵەکان هەبووە، زۆربەیان کاری خزمەتی ژنەکانیان کردووە، بەرپرسی یەکەمیان سوڵتانەو دوایی دایکی سوڵتان و ژنی بەقەدری **ئیمپراتۆرییەت** و لە دواییشدا کیژ و نەودکانیانە، ئەوانیش بە کوێرەی تەمەنیان **جۆری خزمەت** و چاودێریان بۆ دانراوە، ژنەکانی سوڵتان و ژنە لەپێشەکانی **سوڵتان لە ریزی پێشەوەی کەسایەتی مەلکیەت** ناژمێردرێن و پلەی ئەویتریان بۆ **ریزدارکراوە.**

## پلە و پایە

سیستەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە پلە و دەستەلات لە نێوان بنەماڵەکە لەگەڵ مەملەکەتەکانی ئەورووپی جیاوازی زۆری هەبوو، سوڵتان کەس و دەستەڵاتی یەکەم بووە، بەڵام کەسانی تری نزیك لەو خێزانەدا ئەوانیش دەستەڵات و پایەی بەرزیان هەبووە، بۆیە لەناو ئەو خێزانەدا ململانێ و کوشتار بۆ سامان و پلە و میرات نەبووە، کەسانی نزیکی سوڵتان دەستەڵاتی زۆری هەبووە و کۆششی نەکردووە ببێتە سوڵتان و شتەکان بخاتە بن دەستی خۆی.

## ماوه جوانەکە

هێدی هێدی شتە سەیر و سەمەرەکانی خۆرهەڵات بەرەو کۆتایی دەرۆیشت، زەمانی حەریمیش نەما، سەرمایەداری رووی جیهانی گۆڕی. لەناو شادی و سەرکەوتنە گەورەکە و کاتە جوانەکانی ئاهەنگی هێڵی ئاسنین لە یولیوی ساڵی ١٩٠٥ ئەندازیار جۆرج ناجلماکرس کۆچی دوایی کرد. پاش چوار مانگ لە ٢٤ ی فبرایردا تونێلی ناو خاکی سمبلۆن بە درێژی ٣٦٠٠ مەتر کرایەوە، ئەو تونێلە درێژترین هێڵی ئاسنی ترێن بوو لە هەموو جیهان، ئەوەش سیمایەکی تری بە گواستنەوەی ناو ئەورووپای بە ترێنی خێراکەی خۆرهەڵات بەخشی.

رێگای سمبلۆن کۆنە رێگایەکی رۆمانی بووە حەجاجەکانی سەدەی حەڤدە و هەژدەم بەکاریانهێناوە. لە ساڵی ١٨٠٠ هوە نێوان ڤالی ئەلمانیا و بیمۆنی ئیتالیا بووە. پاشان ئەو رێگایە کوێربوویتەوە و بەکارنەهاتووە. ناپلێونی یەکەم فەرمانی داوە ئەو رێگایە بکرێتەوە بوارێکی سەرەکی لە نێوان ساڵانی ١٨٠١ و ١٨٠٧ بەکارهاتووە، پاش سەدەیەك بڕیاردراوە رێگایەك بۆ بڕینی چیای ئەلب بکرێتەوە، پاشان بیرکراوەتەوە بۆ هێڵی ئاسنی بەکاربێت، ئەوەبوو رۆژ بە رۆژ ئەو رێگایە بایەخی زۆرتری وەك هێڵی ئاسن بەکارهاتووە. لەبەر کێشەی پارە و هونەری بۆ ماوەی نزیکەی ٤٠ ساڵ ئیش لەو رێگایە نەکراوە، لە کۆتایی سویسرییەکان و ئیتالییەکان بەستنەوەکەیان لە فبرایری ١٩٠٥ تەواوکردووە.

## ترێنی نایاب

داپیری ئەنا هەستی بەوەکردووە سەفەر بە ترێنەکە خۆشتربووە، بۆیە لە ساڵی ١٩١٣ نووسیویەتی:

فارگۆنەکانی نووستن گەورەتر و ناسکتربوون، هەوای ساردی بۆ دابینکرابوو، گلۆپی گازی بۆ دانرابوو، ئەو گلۆپانە ئەبجورەیان هەبووە، جاران لە کاتی نووستن بە

زانایی گلۆپەکانیان دەشارەوە، ئەوەش ترسی هەبوود. لە سیـــەمەکانیش دەســتکاری کراوە، ئەگەر لە فارگۆنەکە کەسی تر نەبووایە ئەوە بە ئاســانی دەکـرا سیـــەمەکـە دوورخەیتەوەو بوارەکە بۆ نووستن خۆشترو گەورەتر بکەیت.

لەو ســەردەمەدا رۆمانی پاکیزەی نووستنی مــوریس دیکــوبرا وەك نیــشانەیەکـی سەربەستی ژنان ناوبانگی و کاریگەری لەو بوارەدا نواند، ئەو دەمانــە هــەر رۆمــان و نووسین و کاروباری تری تەقلیدی باوبوون، نۆرەی دیکۆر و مۆدەش هــات، ئــەوانــەش گۆڕان و ژنان بە رۆژ تەنوورەی کورتی بە کەشکەشــەیــان لەبــەرکردووە، جلوبــەرگیان قۆلی کراوە و فشیان بۆ کراوە، کڵاوی بە پەرمووچــە و کــوڵی رازاودیــان پێــوەکراوە. ناوقەدیان توندکردووە تــا ســینەیان زۆرتــر دەرپــەڕێــت، پــشتەوەشــیان کلیــل دراوە. پیاوانیش بەیانیان سترەیان لەبەرکردووە و نیوارانیش چاکێتیان لەبەرکردووە، حــەزیان بە سمێل کردووە و رۆشنبیرەکانیش حەزیان بە بەردانەوەی ریش کردووە، پێڵاوی پێیان نووکیی باریك بووەو یاخەشیان رەسمی بووە. لەناو ترێنەکەش ژنــان ئێــواران فــستانی قەدیفەیان لەبەربووە، پێڵاویشیان وەك پێڵاوی لویسی پازدەهەم بەرزبووە و پەنجەوانەی سپییان لەدەستکردووە، خشلی جوانیان لەبــەرکردووە. پیــاوانی نــاو ترێنەکــەش (بــە دەگمەن بۆیان نەبووە جگەرە بکێشن). شوێنی داودتکرنەکانیش بــە پرۆتۆکــۆل بــووە، خوانەکان پان و درێــژ ریزکــراون، دوو جــۆرە شــلە و دوو جــۆرە زەلاتــە و دوو پارچــە گۆشتی سوورکراوە و دوو تەبەق سەوزە و دوو قاپ شیرینی و لــە هــەموو ژەمێکــیش حەوت هەشت بەرداخ کهۆلیش پێشکەشکراوە.

ساڵی ١٩١٣ میللەتانی ئەورووپی بە رووداني خوێنــاویترین کۆمــەڵکوژی مێــژوو زۆر تورە ببوون، ئەوەش هەموو بەشەکانی ئــەو کیــشوەرەی شــێوەیەك لــە شــێوەکان گرتبۆوە، بۆیە بۆ نوای جوانی و رۆشنبیری و زانستی دەگــەڕان، رۆیــشتن و کاروانەکـە گەیشتە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئــەمریکــا، ئــەو بواردیــان بــە کردنــەوەیان بــەرووی کەلتووری ئاوێتەیی رەشەکان و خۆرهەڵاتییەکان دۆزییەوە.

## ترێنی سەردەمی کۆتایی ئیمپراتۆرییەکان

رۆژی ٢٨ ی یونیوی ١٩١٤ رۆژێکی دیارە لـە مێـژووی ئـەورووپـا و ترێنەکـەی و ناکرێت ئەو رۆژە لەبیربکرێت، لەو رۆژەدا لە گـەردکی عوسمـانی سـراییفۆی ئـەرشـیدۆق (فرانسو فردیناند)ی تێدا کوژرا. بەو رووداوە ئاگری شەڕی یەکەمی جیهـانی هەڵگیرسـا. یادی دوا وێنەی ئەرشیدۆق لە بیرماوە، تا ئێستاش زۆرکـەس وەك جلـی رەسمـی شـێوەی کلاوەکەی ئەو لەسەر دەکەن. سوڵتان عبدالحمید وڵاتەکەی لەو شەڕ و پێشهاتەکـانی بـێ تاوان خۆی ناسـاندووە، رەوشی ئیمپراتۆرییەتەکەش ئاڵۆزبوو، لەلایەکی تریشەوە هێزەکانی ئەورووپی بە باشی دەبینرا. لـە هـاوین و بـەهاری سـاڵی ١٩١٤ ئیمپراتۆرییـەتـەکـانی ئەورووپی گەمارۆیان دابوون، تورکەکانیش بـە دوای هاوپـەیمـانێکی بـەهێز دادەگـەڕان. حکومەتی عوسمانیش دوودڵ بوو. لە ئوکتۆبەرا لە پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراودا (ئـەنفـر پاشا)ی وەزیری یەکەم زۆر نزیکی و دۆستایەتی بە ئەلمانیا راگەیاند.

شەڕەکە بە هێرشی بنکە رووسیەکانی ناو دەریای رەش دەستپێکردو بارێجە جەنگیە تازەکان بەکارهاتن. بڕیاری هاوپەیمانی تورکیا و نەمسا و ئـەلمانیـا راگەیانـدرا، ئـەوەش سەرەتای رووخانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و کۆتایی نارامییەکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوو. شەڕەکە کەرم بوو ئیمپراتۆرییەتی نەمسـاویی هەنگاریی کۆششی کـرد ناوچـەکـانی بەلقان زۆرتر بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، بەوەش نەخـشە و دەسـتەڵاتـی ئیمپراتۆرییـەتـی عوسمانی هەژاند و تەسکی کردووە، بۆیە کاروانی رۆیشتنی ترێنەکەش ئاسـتەنگـی زۆری هاتـە پـێش و بـەردەوامی زەحمـەتی تێکـەوت. بـەڵام قوسـتەنتینیە وەك بێلایـەن و دوورەپەرێزی خۆی نواند و سنووردارکردنی دەستەڵاتەکەی لەو ناوچەیە بە ئاسایی نرخاند.

بەکردنەوەی هێلی تازە و نەخشەی نوێی ئەو هێلە لە لایەن ئەلمانەکانـەوە، بەشـێکی تری ئەفسانەی ترێنـی خێراکـەی خۆرهـەڵات هاتـە پێـشەوە، لـە خۆرهـەڵات هـەواڵ و کردنەوەی تۆڕی تری ئەو هێلە خۆشحاڵی نیشاندرا. لەبەر چاوی حاکمەکانی خۆرهـەڵات، پارێزکارەکانیان خۆشەویست و ترسێنەریش بوون، ئەوانەی بریتانیای مەزن و فـەرەنـسا و رووسیایان بە چاوی دوژمنی راستەقینە بینیووە. لە گۆشەیەکی ترەوە ئەوان ئەلمانیایان بە

چاوی دۆست و یارمەتیدەر هەستپێکردبوو. کە عوسمانییەکان لە ساڵی ١٩١٤ بە رەسمی بەشداری ئەو شەڕەیانکرد، ئەوان بە ناوی شەڕی پیرۆز و بەناوی خزمەتکاری هەردوو شارە پیرۆزەکە و خەلیفەی موسڵمان و سەرکردەی باوەڕەوە بەشداربوون. ئەگەرچی ئەوان بەناوی جیهادەوە بانگی موسڵمانانی سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەیانکردبوو، زوو بگەنە کۆشکی ئیمپراتۆرییەت، بەڵام دیاربوو داوەکەیان کەمتر وەڵامی هەبوو، نەك بەشداری نەبوون، بەڵکو بەرگری ناونووسینە گەورەکەی ساڵی ١٩١٦ یانکردبوو، زۆربەی موسڵمانەی ئیمپراتۆرییەتی رووسی هاتنە ناو سوپاکەی قەیسریش.

لەندەن زووتر و لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمینەوە یارییەکی هاوپشتیان هەبوو، ئەویش هاشمییەکان و شەریفییەکان و ئەمیرەکانی مەککە بوو، کوشاریان خستە سەر ئەوانە. لە ساڵی ١٩١٤ عوسمانییەکان بۆ ناساندنەوەی هێزی خۆیان لە ناوچە عەرەبییەکان داوایان لە سوڵتان شەریف حوسین و کوڕەکانی کرد بۆ نیشتەجێبوونیان بێنە قوستەنتینیە. گۆشارەکانی تورکەکان زۆرتر دەبوو تا هەموو شتەکان بە بۆیە تۆرکییەوە رەنگی دەدایەوە. کۆششیان کرد هێڵی ئاسنینی ترێنی خێراکەی خۆرهەڵات بگاتە حیجاز، هەرەشەی رووخاندنی مەملەکەتەکەی شەریفییان کرد، ئەوەش دڵۆپەی دوایی بوو لەسەر بەرداخە پڕبووەکەی رەوشە کرا و باردکەی شێواند. لە هاوینی ساڵی ١٩١٥ شەریفی مەککە نامەیەکی بۆ پارێزگاری بەریتانی باڵا ناردبوو و کێشەکەی بۆ روونکردبۆوە، ئەو نامەیەش کاغەزەکانی پۆکەری خستە سەر مێزەکە.

## لۆرانسی عەرەب

لە هاوینی ساڵی ١٩١٥ پیاوێکی شۆخی پێست سپی بە دەمانچەیەکی ئەڵمانی جۆری مۆسر و کامیرایەکی فۆتۆگرافییەوە بەرەو شاری بەغدا سواری ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات بوو. هەندامەکەشی چاکێتێکی چینراو بە داوی باریك و کراسێکی سپی لەسەربوو، لە سەرەوەشی پشتێنێکی کوردی بە بەروو بەستراوی بەستبوو، ئەوەش نیشانەی کوڕینی بووە، لەناوەکەیەوە دیاربوو پیاوێکی زۆر لە رێبوارەکانی تری ترێنە جیاوازبوو، شەیدای

خواردنەوە و کەوڵ و شتی تریش بوو، بەوەش ناسرابوو وەك بدویەکی عەرەب، بە زمانی عەرەبی قسەی کردووە، وەك ئەوانیش لە ژینی بیابان راهاتبوو، خۆی وا پێناسە کردبوو:

عەرەب کارێکی موکناتیسی لەسەر بیری من دانابوو.

بەراستی ئەو لۆرانسی عەرەبان بووە،

پیاوێکی درۆزن ؟

جاسووس؟

شانۆکار؟ بوو،

وەك وینستۆن تشرشل پێناسەی کردبوو:

ئەو یەکێکە لە گەورەترین ئەمیر، سروشت بەو جیهانەی بەخشیووە.

جارێك بۆ پێناسەی خۆی وتبووی:

من ئەو کەسە نیم تەنها بە سێ وشە پێناسە بکرێم.

لە راستیش وابوو، کەسێکی سەیر و شاراوە و داخراو و رەخنەلێگیراوی بەردەوام و کارکەربوو، بەناو و پەردەی شوێنەوار و توێژەر و یارمەتیدەری هەواڵگری و بەرپرسیی سەربازی و دبلۆماسی و نووسەرو دڵی هەموو شتێك و رووحی شۆڕشی عەرەبی دژ بە ئیمپراتۆرییەتی عوسمان و ئازادکەر دیارکەوت، بەئاسانی ئەو رێبوارەی ناو ئەو ترێنە ناناسرێت!

تۆماس ئدوارد لۆرانس لە ٦ ی ئوگستی ساڵی ١٨٨٨ لە وڵاتی غال (ویلز)ی بریتانیای مەزن لەدایکبووە، بەدرێژایی ژیانی هەستی بە ناشەرعیەتی دایکی کردووە و باوکی بەرەڵای کردووە، لەگەڵ چوار کیژ و سستەرێك ژیاوە کە پێنج کوڕی هەبووە.

ئەوانەی لە منداڵییەوە لە لۆرانس نزیکبوون، هەستیان بە زیرەکی زۆری ئەو منداڵە کردووە، هەر لە تەمەنی دوو ساڵییەوە زیرەکی پێوە دیاربووە، لەو تەمەنەوە بە بیستن لە برا گەورەکەیەوە ئەلف و بێ لاتینی لەبەرکردووە، لە تەمەنی شەش ساڵییەوە زمانی لاتینی خوێندووە. لۆرانس منداڵی بووە خێزانەکەی زۆر گەڕاون، تا لە وڵاتی فەرەنسا

گیرساوەنەتەوە، لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٨٩٦ هوە لـە ئوکسفۆرد جێگیربـوون. لەوێیـەوە سەرلەنوێ خێزانەکە منالەکانی لەسەر رەوشی ژیانێکی نوێ راهێناوەتەوە.

لۆرانس لە منالییەوە بە تەنها ژیاوە، لە مالـەوە حـەزی بـە تـەنیـایی کـردووە، لـە گۆشەیەکی باخچەکەیانەوە ژوورێکیان بۆی دروستکردووە، ئەوە رەوشێکی بـاش بـوو تـا زۆرتر بخوێنێت و لەگەڵ خەونەکانی ناوێتە ببێت.

## زەبەلاحەکەتان

لۆرانس لە ناو پێنج کوڕ گەورەبووە، هاموشۆی مێیانی کەمبووە، بۆیـە شـەرمـن و رووتەنك بووە، زوو لەناو ژنان بێزاربووە و دوورکەتیتـەوە، بـەلام چـاوی لـە یـەکێـك لـە ئەفەرەکانی ترێنەکە بریوە و لە دوای ئەو ماودتەوە، ئەویش رێبـوارە ناسـراودکەی بیابـان (گرترود بال) بوو، ئەوەی چەندین جار بیابان و بواری تەنگەبەری بەتەنیـا بریـوە، پاشـان داوەرایتەوە و بوویتە راوێژکاری سیاسی ئەو لە بەغدا.

لە تەمەنی ١٦ ساڵییدا لە شەڕێکدا لەگەڵ هاوڕێیـەکـانی قاچـێکی دەشـکێ، بـەلام لەبەر ئازایەتییەکەی بە سەرخۆی ناهێنێت، تا دەرسەکەیان تەواو دەبێت، پاش کرتنەوەی قاچە شکاوەکەی ماوەی شەش مانگ لە جێگا دەمینێتەوە، کە چاکیش دەبێتەوە کەشەی جەستەی رادەوەستێت، بەژنی لە مەترێك و ٦٤ سم بلندتر نابێت. لەبەر ئـەوەی تووشـی کەمایەسی فیزیولۆجی بـووە، بۆیـە نـەیتوانیوە رۆژانـە هـاوڕێی برادەرەکـانی بێـت لـە یارییەکانی سپۆرت، تا سەرنجی هەموو لایەك بۆ خۆی راکێشێت چەندین مەشقی سەیر و چالاکانە دەکات، بەو چالاکییانەیە ناوی دەرکردووە و ناوی لە خۆی ناوە زەبلاحەکەتان.

## سالانی گەشەکردنی

لۆرانـس بەردەوام کارکەر و شەیدای مێژووی کـۆن و ئـەرکۆلـۆژی بـووە، لـە رۆژانـی پشوودانەکانیدا بە پاسکیلەکەی رۆیشتۆتە نونجـۆ و بریتانیـا و ولاتـی غـال، سـەردانـی کۆشکەکانی کردووە و دەراسەتی هەندەسـەی سەربازی بۆ کردوون. لە سـالەکانی سەردتـای

کارکردنیدا یاریدەری پارێزگاری و پارێزگاری مۆزەخانەی شوێنەواری ئاسیوە، ئەوانیش لە هەموو قۆناخەکانی ژیانیدا سوودی لێیان بینیوە. لۆرانس بەشداری ئەو دەستەی بەریتانی شوێنەواری کردووە بۆ گەڕان بەدوای شوێنەوارەکانی بەشی راستی رووباری فوراتی کردووە، بۆیە زووتر ویستوویەتی زمانی سەرنشینانی ئەو ولاتە بزانێت، چوویتە خوێندنگای نێردراوی ئەمریکی لە بیروت، تا کۆرس لەسەر فێربوونی زمانی عەرەبی وەرگرێت، زووتریش لە زانکۆی ئوکسفۆرد دەستی بەو خوێندنە کردووە.

## گیانبازییە سەرەتاییەکانی

بەرنامەی و کاری سەرەکی لۆرانس شوێنەوار و پشکنین بووە، بەلام دەیزانی بەرەو مەبەست و کاری تر بەرنامەی دەبێت، خۆی لەناو ئەو ترێنە گوم کردبوو، دەرویشت و ئامانجەکەی دیار نەبوو، بەرەو کێ و چۆن .. ئەوەی نەدەزانی؟ زۆر دەوازەو گیانبازی و کۆڕانی لە پێش کرابوونەوە. ئیمپراتۆرییە پیرەکەی عوسمانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەلمانیا و بەریتانیا سستکردبوو، رووسیا بڕوای بە رووخانی نەدەکرد تا بەسەر لاشەکەی نەکەوێت. لە ساڵی ١٩١٤ و پێش هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهان لۆرانس سەردانی بیابانی سینای کردووە، لەو ماوەی کاری شێوێنەواری کردووە، فێری نەخشە و گەڕانیش بووە، ئەوەشیان سوودی هەبوو تا وەك ئەفسەرێك شارەزایی پەیدا بکات، وەك ئەفسەرێکی زیرەك راسپێردرابوو نەخشەیەکی ناوچەکە ساز بکات، ئەوەش ئامادەبوون بۆ ئەگەری روودانی شەڕێکی مەزن دژ بە تورکیا. لە یونیوی هەمان ساڵدا راسپێردرا و بوار و هێڵی پێشنیارکراوی هێلی ئاسنینی نێوان بەرلین و بەغدا دەستنیشان بکات، تا ببێتە بەدیلی ترێنە خێراکەی خۆرهەلات. لە ٢ ی ئوگستی ١٩١٤ تورکیا پەیمانی خۆی بە ئەلمانیا دژ بە ئینگلیز یەکلاکردبۆوە، لەو رۆژانەدا لە دوورگەی عەرەبی شۆڕشی عەرەبی لەناکاو بۆ بەرژەوەندی ستراتیژییەتی بەریتانی بەرپابوو.

# پاشا عەرەبە بێ تاجەکە

سەعاتەکە لێدرا، چوار مانگ بوو شەڕەکە دەستیپێکردبوو، لۆرانس خۆی لە شاری قاهیرە دۆزییەوە، لە میسر سەردانی بەرژەوەندی پێشوازی و بەرژەوەندی نەخشەکانی سوپای میسری کردبوو، ئەفسەرێك پێشوازی کردبوو، سەرەتا بە دیمەنەکەی سەرسام ببوو، وەك سەماکەری یاری گاڵتەکردن و دەستبازییان هاتبووە پێش چاو، ڕۆیشتنەکەی زۆر بە سەماکردن دەچوو نەك ڕۆیشتنی ئاسایی.

لە ٢١ی مارسی ١٩١٦ نووسینگەی عەرەبی سەر بە بەرژەوەندی پێشوازی بەریتانی دامەزرا، لە ئوکتۆبەرا لۆرانسیان بۆی نارد، پاش ماوەیەکی کەم، بەدروستی لە سەرەتای ئەپریلا بەرپرسەکانی تاقەتی مانەوەی ئەویان نەما، بە ترێنێکی پلە خوارتر لە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات، بۆ دەستەمۆکردن و کڕینی ئەفسەرێکی تورك تا گەمارۆکەی سەر کۆمەڵگایەی چەند سەربازی ئینگلیزی تێدا گەمارۆدراوە بۆ هەڵگرێت، یان هەرهیچ نەبێت بە تەسلیمبوونەکە ڕازی بن، ڕەوانەی شاری (بەسرا)یانکردووە، بەڵام ڕاسپاردە و کارەکە بە فەشەلێکی گەورەی کۆتایی پێهات. لۆرانس بیری لە شۆڕشێکی ناوچەیی کردووە، بەڵام سەرکردە ئینگلیزەکان ڤیتۆیەکی توندیان بەرووی بەکارهێنا، وتیان هێشتا کاتی نەهاتووە. لۆرانس ڕەوانەکرا تا هەواڵی هەر چوار کوڕەکەی شەریف حوسێن و سەرۆکی لەشکرە عەرەبییەکانی چەکدارکراو لەلایەن ئینگلیزەوە بپرسێت، لەوێ زوو بە ئەمیر فەیسل سەرسام بوو.

لە ١٠ ی یونیۆی ساڵی ١٩١٦ پێشەوای هاشمییەکان خۆی وەك پاشای هەرێمەکانی عەرەبی ناساند، ئەو هەواڵ و پێشهاتە ڕۆژێکی بایەخداربوو لە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی هاوچەرخ و ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتیش.

ئەو شۆڕشە نەخشەی جیوسیاسی ناوچەکەی گۆڕی، بوار و هەواری ترێنەکەی بە یارمەتی بەریتانیای مەزن و میسر دانا. سوپاکەی هاشمییەکان بە سەرۆکایەتی فەیسل و ڕێکخراوی لۆرانس ژمارەیەکی زۆری سەربازی عوسمانییان لە (مدینەی منورە) و سوریا گەمارۆدا، بۆیەش سوپای قوستەنتینیە بەغدا و پاشان قودسی چۆڵکرد. پاش ئەو

سەرکەوتنە لە مارس و سپتمبەری ساڵی ۱۹۱۷ ئەو ناوچانە کەوتنە بن دەستی بەریتانییەکان. لە سوریا و عیراق هیچ سەرهەڵدانی دژی بابی عالی بەرپانەبوو، لەو ناوچانەش سەربازە عەرەبییەکانیش بە کۆمەڵ لە سوپای عوسمانی رایاننەکرد.

## هەرەسی ئیمپراتۆرییەتەکە

ئیمپراتۆرییەتی رووسی و پاشان ئەڵمانی و پاشان ئەمساوی هەنگاری رووخان، لە پاش ئاگربەسەکەش ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیش هەرەسی هێنا، قوستنتەنیە کە زانی رەوشەی ئاڵۆزە و بەرەو رووخان دەچێت، کۆششی کرد پەیوەندی بە وڵاتان و میللەتانی هاوسێی خۆش بکات، بەڵام دەرکەوت مەسەلەکە درەنگ بوو، ئەو هەنگاوەش ناتوانێت لە خنکان رزگاری بکات. عوسمانییەکان ویستوویان کۆمەڵکوژییەکەی ئەرمنییەکانی نێوان ساڵانی ۱۹۱۵ تا ۱۹۱٦ بزر بکەن، بەرپرسانی ئەو کۆمەڵکوژییە بە پاپۆری تایبەتی جەنگی ئەڵمانی لە نۆڤمبەری ۱۹۱۸ رەوانەی تاراوگەیان کردن. لەو رۆژەوە هێز و لەشکرەکانی وڵاتانی بەریتانی و فەرەنسی و ئیتالی و یۆنانی چاودێری پایتەختیانکرد، یۆنانییەکان ئازادبوون کڵاوەکانی سەریان فرێ بدەن و تورکەکانیشیان ناچارکرد کرنۆش بۆ ئاڵای یۆنانی بەرن، هەروەها پاش ئەو گۆڕانە گەورانە ترێنەی خێرایەکەی خۆرهەڵات کەوتەوە کار و لەو سنوورانەوە کاری کردەوە.

لە ساڵی ۱۹۱۹ هەزارەها عەرەبی هاووڵاتی کۆنە عوسمانی ناوچەکەیان جێهێشت، بەرەو وڵاتانی نوێ رۆیشتن، وەك سوریا و عیراق و فەلەستین. تورکەکان دووچاری ترس و برسییەتی هاتن، داوەشان و رووخانیان پێوە دیاربوو. لە شارەکانا شووشەی پەنجەرەکانیش نەمابوو، بۆیە تابلۆکێشان بەناچاری تابلۆکانیان لە جیاتی شووشە و جام بۆ پەنجەرەکانیان دەفرۆشت. پاش چەند مانگێك بنەماڵە دەستەڵاتدارەکە ناچارکران وڵات چۆڵ بکەن، بۆ وڵاتانی تر سەفەربکەن، ئەوانەی ناچاریش نەکرابوون ژنان و بێوەژنەکان بوون، هەموویان کەوتنە شاری نیس و ئەسکندریە، یەکێك لە سوڵتانە شەرەکەر دژوارەکە، ئەوەی شەڕی

خوێناوی دەکرد، وای لێهات ددانە زێردکـانی دەردەهێنـا و لەبـەر نـەبوونی دەیفرۆشـتن، چارەنووسـەکەشی بە خۆکوشتن کۆتایی هات.

## ترێنە نوێیەکە

لەو رۆژەوە پاشاکان نەمان، تا ترێنە خێرایەکەی تایبـەت بـە خۆیـان زەفـت بکـەن. بازرگانە ئەورووپاییەکانیش بۆیان هەبوو ئەو ترێنە بۆ هەموو گەشتەکانیان بـەکاربهێنن. هونەرکارە ئەورووپییەکان لەو هێلە گـشتییەی ترێنەکـە هێلێکیـان بـۆ شـاری مەدینـەی منەوەرە جیاکردەوە. لە ساڵی ١٩٢٤ رێککەوتننامەی لۆزان مەسـەلـەی دانیێپـدانانی بـە کۆماری تورکیای براندەوە، لەو رۆژەوە مێژوویەکی تـر لـەو ناوچـە و لـە تورکیـا هاتـە پەیداکردن، ئەوەش میللەتی تورکی لە رەگەوە گۆڕی.

## خۆرئاوایی کردنەکەی ئەتاتۆرک

**کەمال ئەتاتورک وێنەی بەرجەستەی** راستەقینەی ئـەو قۆناخـەبـوو. لـە سـەرەتـای سەدەی شازدەهەمە تورکەکان کاریان بۆ هاوچـەرخییـەتـی و بـە خۆرنـاواکردنی تورکیـا کردبوو، کە ئەتاتۆرك حوکمی وەرگرتووەو زانیویـەتـی خۆرنـاوا نموونـەی شارسـتانییەتی هاوچەرخی پێوەیە، بۆیە ئەو بەرنامەی قووڵتر و زۆر بەرجەستە و بە پراکتیـکـی کـردووە. لەو بەرنامەیدا گۆشاری عەرەبی و فارسی رەتکردیتەوە، ئەگەر دابڕانەکانیـان بـە رابـردوو کەم و لاوازیش ببـوو، ئـەو دابڕانەکـەی کـردە یـەکجـاری و زۆرتـر لـە کـۆن و دوێـنێ دوورکەوتەوە. پێش ساڵی ١٩٢٤ شاری قەستەنتینیە تەژی هاووڵاتییانی نەتەوەکانی تـر بوو، بەڵام پاش ئەو پێشهاتەو پاش ئەو بەروارە بە لێشاو هاووڵاتییـانی نەتـەوەکـانی تـر شارەکەیان جێهێشتووەو لە تورکیا دەرچوون، بەو شێوەیە ئەو شارە تـەنهـا تـورکی تێـدا مایەوە. زۆر لە رووسە سپییەکان هاتنە ئەو شارە، ئـەوان بـە پێـچەوانـەی بۆچـوونەکەی قەیسر هاتنە قەستەنتینیە، خەونەکەیان هاتەدی، هەندێکیان بازاڕ و چێشتخانە و عیادە

و فرۆشگاکایان کرده‌وه، له‌به‌ر ناله‌باری ره‌وشی ئابووری ته‌نها بۆیان هه‌بوو شه‌وانه له خانه‌کانا بخه‌ون.

پاش هه‌ڵگیرسانی شۆڕشه‌که‌ی به‌لشفی بابوباپیری ئه‌ناو کیژه‌که‌یان ڕێگای تاراوگه‌یان به‌ره‌و ئه‌و شاره هه‌ڵبژارد، به‌ڕێگای ئۆکرانیایه‌وه، به‌ڵام له ده‌ریاوه هاتن، له ئه‌سته‌نبۆڵ براده‌رێکی کۆنیان رووسیان پێشوازیکردن، پلیتی سه‌فه‌ری پاریسی به ترێنه خێراکه بۆ ئاماده‌کردبوون، له‌به‌رئه‌وه‌ی ترێنه‌که زۆرتر نه‌ده‌مایه‌وه و چاوه‌ڕوانی نه‌ده‌کرد، بۆیه ئه‌و خێزانه پایته‌ختی کوردانیان نه‌بینی (ره‌نگه وه‌رگێره عه‌ره‌بییه‌که هه‌ڵه‌ی کردبێت، مه‌به‌ستی پایته‌ختی تورکان بێت، و:). زینه‌ی ئه‌وه‌ی پاشان بوویته داپیری ئه‌نا فرمێسکی له چاوانه وشك نه‌ده‌بوون، به‌رده‌وام ده‌گریا، ئه‌گه‌رچی شاری ئه‌سته‌نبۆڵیان زۆر که‌م بینی به‌ڵام دیمه‌نی ئه‌و شاره کاریگه‌ری زۆری له‌سه‌ر دانابوون. له‌سه‌ر سپۆره‌که‌ی (شۆسته) ترێنه‌که براده‌ره‌که‌ی خێزانه‌که‌یان به ده‌ستماڵه حه‌ریره سپییه‌که‌ی فرمێسکه‌کانی زینه‌ی سڕییه‌وه، فرمێسکی وه‌ك باران ده‌هاته خوارێ بۆیه ده‌ستماڵه‌که‌ی تا گه‌رده‌نیشی برد و به نه‌رمی ده‌ستی به لووتیشی که‌وت، وه‌ك ئه‌وه‌ی پشیله‌یه‌کی سه‌ر قوماشێکی حه‌ریر بێت، بۆنی پێستی رووسه‌که بکات. پیاوه‌که بزه‌یه‌کی هاتی و رووی هێنایه پێش و ماچێکی باوکانه‌ی له روومه‌تی کرد و وتی:

سه‌باره‌ت به ڕێگاکه براده‌ران سوپاسم مه‌که‌ن، هیوادارم هه‌ر چوارتان خودا بتانپارێزێت.

## ئاواره‌کان

ئه‌و چوار که‌سه که‌لوپه‌لی زۆر که‌میان پێبوو، ته‌نها چه‌ند پارچه جلوبه‌رگی پێویستیان بۆ خۆگۆڕین کڕیبوو. ئه‌گه‌رچی پاره‌یه‌کی که‌میان پێبوو، به‌ڵام داپیره‌ی ئه‌نا گێلییه‌کی زۆری کردبوو که فارگۆنی تایبه‌تی گرتبوو، هه‌ردوو کیژه‌که شوێنی تایبه‌تی باشی نووستنیان به‌رکه‌وتبوو، له دیار گلۆپی نازداریش بوون. دایك و باوکه‌که به دڵخۆشی هه‌ردوو کیژه‌که‌ی زه‌وقیان هه‌بوو، که له پێش به‌رپرسی هوتێله قوفله زێرینه‌که‌وه

وەستابوون، هەوای بێگەردیان هەڵدەمژی. بەرپرسەکە بۆ دڵنیایی سەلامەتی و دروستی هەموو شتەکان لەوێ بوو. دایك و باوکیان بۆ خۆشی و کات بەسەربردنی چوارکەس، سەبەتێك هەویرکاری و شیرنەمەنی و چاو هەندی چەردزاتی رووسی نەمریان هێنابوو، تا منالەکان لە چاودڕوانی ترێنەکە بێزارنەبن سەری سەبەتەکەیان بۆ کردنەوە، برادەرەکەشیان ئەوەی لەبیربوو چەند شووشەیەك **شمپانیای بۆ پێویستی** بۆ دانابوون. بەڵام باوکیان وتبووی:

گەورەکانم واز لەو سەبەتە **بهێنن، من لە چێشتخانەکەی** ترێنەکە داوەتتان دەکەم.

ئەو بە سێ مێینەکە **سەربەرزبوو، ژنە نەجیب** و جوانەکەی بە کراسە نایابەکە و کیژە گچکە ئەسمەرەکەی **تەمەنی سەرووی ۱٦** ساڵ بوو، ئەویش کراسێکی سووری لەبەرکردبوو، **هەموو شتەکانی لە دایکیەوە** بۆ مابۆوە، کیژە گەورەکەشی کراسێکی شینی لەبەربوو، **ئەویشی تەمەنی ۱۸** ساڵان بوو. پیاوەکە تەنها شتە کرنگەکانی تایبەتی خۆیانی **هێنابوو، ئەگەرچی زۆریشی جێهێشتبوو**، بەڵام گیان و رووحی دەربازکردبوو لە مردن **رزگاری ببوو.**

**ترێنەکە** بە رۆژ بەرێکەوت، ناوچە بە ناوچەی دەبڕی، بە دوورکەوتنەوەی بۆنی **خۆرهەڵات** کەم دەبۆوە. فارگۆنە تایبەتەکە قەرەباڵغ بوو، بەرپرسەکە بێ چای نەدەکردن. ئەو سەفەرە بۆ گێرانەوەی پەیوەندییە جوانەکەی نێوان ساڵانی ترس و گومان بوو، لەو ماوەیەدا ئەنا زۆر سەربردەی ساڵە جوانەکانی ژیانی لە پاریس گێرایەوە.

لە لۆڤەر دیدارمان بوو، لەسەر داوای مامۆستاکەی وێنەکێشانم، من زۆر لە کتێبخانەکەی خەریکی رۆژ ژمێرەکەم بووم. ئەو رۆژە پیاوێك کەوتە تەنیشتم بۆ یەکتری بزەمان هاتێ، من لاستیکی رەشکردنەوەکەم لە دەست کەوت، ئەو بۆی هەڵگرتەوە و دایەوە دەستم، بەیانیش لە هەمان شوێن یەکترمان بینیەوە، ئەوە چەند رۆژی تر دووبارە بۆوە، وای لێهات یەك سەعات لەیەك دانەدەبڕاین.

ئەو هۆڵەکانی میسری لە لۆڤەر نیشاندام، داوای هاوسەریەتی لێکردم، نووسینەکانی بۆدلێر و لوتریامونت و مالارمی دامێ، ئەوانەم خوێندەوە، بە هۆی ئەوەو پاریسم دۆزییەوە، ئەو پاریسی وەك گیرفانی خۆی دەناسی، بەندی فرونسوا فیولان و فیرلان بوو،

بەند و شەیدای هونەرمەندان و بازاڕەکان و کوچەکان و باخچەکان و کەنیسەکان و مۆزەخانەکانیش بوو.

دبلۆماسە پیرەکە کلەیی کرد، بە کامەرانییەوە بیرەوەرییەکانی بەبیرهاتەوە و وتی:

لە بیرت چوو پێیان بڵێیت، من زۆر لە تۆ لە پێشتربووم. بۆ زانیاریتان من جاری یەکەم لەگەڵ باوکم هاتبوومە پاریس ئەو ئەندازیاری ڕێککەوتنی هەڤاڵبەندی فەرەنسی ڕووسی بوو، من زۆر بەختیاربووم بە بەشداریم لەو ئاهەنگە ئەمرە، بەو ترێنە هاتین، ئێمە ٤٢ ئەفسەرمان لەگەڵ بوو، پێشوازییەکی زۆر مەزن کراین.

## شارەکانی ڕووناکی

ناپووردی پێشوازییەکە زۆربوو، بۆ دیتنی ئێمە زۆر کەس بەسەر دارانیش هەڵگەڕابوون، لە کۆشکی ئالیزیا و سەفارەت و وەزارەتی کاروباری دەرەوەش پێشوازی کراین. ئاسمانیان لە تروکادیرۆ تەژی یاری ئاگرین کرد، ئێمەیان بردە شاری ڕووناکی، لەوێ وێنەی یەکەمی گەڕەکەکانی (سگی پاریس)م بینی، ئاهەنگەکان بەردەوام بوو، لە ماڵی بوتل و شابۆ خواردنی ٥٤٦ کەس لە هۆڵەکانی هوتێلی شارا ئامادەکرابوو. لەناو کۆردپانەکەش دوو باریجەی سەربازی بۆ نیشانەی هەڤاڵبەندی سەربازی ڕووسی فەرەنسی وەستابوو، ئەوەی ئێمە بۆ دانووستانەکەی هاتبووین. لەسەر باریجەکانیش تیپی مۆسیقایی سروودی سەرکەوتنی هەردوو وڵاتانی بە جۆشەوە لێدەدا. بەو شێوەیە باوکم بە جلی ڕەسمییەوە بینی، لەسەر ئەو مێزە خواردنە ڕازاوەنەوەبوو کە لە ناو باخچە سروشتییەکانەوە ڕیزکرابوون، ئاهەنگێکی خۆشیش کۆتایی بە دانیشتنەکە هێنا، هەرچی بووبێت تا ئەو سەعاتەش من لەو ئاهەنگە بە پارێزم ...... لەناکاو شەوق و سۆز و بیرەوەری لە چاوان بەدی دەکرا.

دەکرێ ئەوان لە تەمەنی بیستساڵیان، تامی سەربەستی بکەن ؟؟ لەو پاریسەی ئەو ڕۆژە کە وەك بووکە، شانۆی ڕۆمانی بەختیارییە بە لەدایکبوونی خۆشەویستی ئەو دوانە، ئەوان وا باسی باخچەی لکسمبۆرگ دەکەن، بۆنی فڕنەکانی پاریسی تایبەتی دەکەن،

وێنەی هەوری سەر رووباری سین چەند جوان دیارن، ترێنەکە لەناو باخچە و کێلگەکانەوە دەڕوات، دەڕوا و گەوەو پێچەکان دەبڕێت و هەوری دووکەڵەکەی ئاسمانی پڕکردووە.

کیژە گەورەکەی، کە شێوەی لە دایکی دەکات، بەڵام دایکی وەك ئەو ئارەزووی وێنەکێشانی نەبوو، لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، کاربۆنەکە ئاسمانی رەشکردبوو، لەبەر خۆییەوە دەیووت:

دەبێ ئەو رەشاییە زەوقی وێنەکردنی هەورمان بکوژێت!

بەبەردەوامی رۆژمێرەکەی لەناو دەستی بوو، لاپەڕەکانی کردەوە و ئیشارەتی ترێنەکەی وێنەکرد، ئەگەرچی ئەو زۆریش بە پێشەوەی ترێنەکە دڵخۆش نەبوو، بەڵام وێنەکێشانی ترێنێکی وا جێگەی شانازییەکی گەورەبوو بۆ ئەو، تام و چەشەیەکی زۆری لا دروست دەکرد.

بەدەستی لەسەر دەستماڵە سپییەکە ئەوەی دانا، رۆژێ دێ بەرەو سەدەی زێڕینی بەرێدەکەوین، بەرەو ئەستەنبۆڵ و ئەفسانەکانی. بەرەبەیان بوو، کە ترێنەکە لە ئێستگەکەی پاریس راوەستا، جامی پەنجەرەکە بە تەم گیرابوو. هەر چواریان بەو تاکسییە نوێیانەی تازە لە جیاتی کۆنەکان کەوتبوونەتە کار بەرەو هوتێلەکەی کەرەکی لاتینی بەرێکەوتن، ئەوەی داپیری ئەنا یادگاری زۆری تێدا هەبوو. کیژە گەورەکەیان زۆر لەگەڵ خێزانەکەی نەمایەوە، بەرەو پراگ بەرێکەوت، لەوێ بۆ خوێندنی زمان رۆیشت، کیژە گچکەکەش پیاوێکی رووسی دۆزییەوە و شووی پێکرد، ناوی ئەناتۆلی بوو ئەویش زانای شوێنەواربوو.

# ساڵەکانی پاش شەڕەکە

ڕێگای نێوان پاریس و قوستەنتینیە لە ساڵی ۱۹۲۰ بەو ترێنەکە ۹٦ سەعات بوو، لە ساڵی ۱۹۲٦ ئەو ماوەیە بۆ ٦۰ سەعات کورتکرایەوە، هەر لەو ساڵە بە ۵۷ سەعاتیش ترێنەکە گەیشتووە. بۆیەی یەکەمین ئوتومبێل بیر و گۆڕانی بەسەرهاتووە، سەرەتا ویستیان ڕەنگی تاریکی بۆ بەکاربهێنن، بەڵام بەرپرسی وەرشەکە کە راوچییەکی کۆن بوو ڕەنگی شینی تاریکی بۆ دانان، ئەوەش لەو ڕەنگەوە هاتبوو خۆی جاران ئەو ڕەنگەی لەبەرکردووە. ئەو ئوتومبێلانەی کرێ، دیکۆری داریان هەبووە، ۱٦ کورسییەکەی لە چەند ڕیزێکەوە پێکهاتبوو. لە ساڵی ۱۹۲۵ وەرشەکان یەکەمین دەستە ئوتومبێلی کانزاییان بە ٤۲ و ٥٦ کورسی هێنایە دەرەوە، ئوتومبێلەکان لەسەر هەمان پرنسیپی جارانەوە ڕەنگیان شین بوو. لەو ڕۆژانەدا گۆڕینی جیوپۆلیتکی زۆر هاتە ناراوە، ئەلمانیا لە ڕەوشی سەرکەوتنەکانی ناهەنگی هەبوو، ئیمپراتۆرییەتی نەمساویی هەنگاری لە تەقینەوەدابوو، ئەوەش ڕەچاوی سەرهەڵدانی چەند وڵاتێکی لێ دەکەوتەوە، ئەوانیش هەڤاڵبەندی زۆریان لێکەوتەوە، ئیتالیا کەوتە ناو بازنەی ئوردوگای هاوپەیمانان و یوگۆسلافیاش دروستبوو، ڕۆمانیاش خەونی بە وڵاتانی خۆرهەڵاتییەوە دەبینی.

پاریس و لەندەن بۆ بەستنەوەی ئەورووپا بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە وڵاتانی جرمانییەوە، بایەخی ستراتیژی ئەو ترێنە خێرایەیان دەزانی، هێلەکانی سویسری و ئیتالی و نەمساویی و هەنگاریی بەرەو بەلگراد خاڵی هاوبەشبوون بە بەستنەوەیان بە ترێنی خێراکە. لە ڕۆژانی نێوانی ۱۸ و ٢٦ ی مارسی ساڵی ۱۹۱۹ لە پاریس کۆببوونەوە بۆ ڕاگەیاندنی ترێنە خێراکەی نێونەتەوەیی نوێ. کۆڕی ئاشتی فرسای دەبووایە دەستوبردبن بۆ بەکارهێنانی ئەو هێلە تازەیە و پشتیوانی هێڵی سمبلۆنی ترێنی خێرای خۆرهەڵات بکات. بۆچوونە سیاسییەکان نیگایان لە یەکێتی ئەورووپابوو، ئەوەش لە ڕووی بازرگانییەوە داهاتی نەبوو، بێجگە لەوەش ئەو بیرۆکەیە چەندین کێشەی ناوخۆیی

ئەورووپی دەهاتنە پێش، ئەو وڵاتانەی ئەو ترێنەی بەناودا دەڕۆیشت کێشەی زۆری تێدا گەرم بوو.

ئانارامی لە ئیتالیا هەبوو، ئاسایش لە بەلقان نەبوو، کوشاری ناوخۆیی ناو تورکیا زۆربوو. لەناو ئەو هەموو کیشانەش تۆڕێکی ئالۆزی ناو وڵاتانی بەلقان هاتە دروستبوون. لەناو هەموو ژان و خوێناوییەکانی رۆژانی شەڕی جیهانی یەکەم و تەنگژەکانی ساڵی ۱۹۳۰ لاوان لەناو ترس و دڵەڕاوکێ و خەفەت دەژیان، تاکە سەرچاوەی خۆشی و خۆلەبیرکردنی رۆژە تاڵەکان کات بەسەربردنی ناو ئەو ترێنە خێرایەی خۆرهەڵاتبوو، لەوێ هەستیان بە تامی ژیانکردووە.

## بوژانەوەی ژیان

میستاقات بە قاچە درێژە جوانییەکەیەوە بە دەنگی خۆشەوە کۆرانی بۆ پاریس وت، شازادەی جیهان و بە هەمان بۆنی پیاوانەوە و وشە جوانەکان موریس شوفالییە لە ساڵی ۱۹۲۱ گۆرانییەکانی (بۆ ژیان، با زۆر سەرقاڵ نەبین، من کوێ نادەمێ، برسییەتیش دەڕوات، هەموو شتەکان رێکدەخرێتەوە) چڕییوە. لەناو ئەو ترێنەدا ژن و مێردی ناودار مێژووی ئەفسوناوییان هەبووە، وەك وکتۆ و رادیقات و دیاکیلایف و لیفار. سەما و موسیقای ڤالس باوی نەمابوو، رێبوارانی ئەو ترێنە چاویان لە مۆدەی نوێ و ئاواز و جۆشی مۆسیقای تازەبوو، سەرەتا سەمای فلامینکۆ و تونگۆیان داواکردووە، ئەوانەش سەمای کۆنی ئەندلسی بوون، لەناو قەرەجەکانی ئەو دەڤەرەوە گەیشتە ئەرجنتین، سەماکە بەرەو ئەمریکا رێی کردبوو. لە سالانی ۱۹۲٥هوە سەمای رەنگەکانی ستاب و فۆکس تروت سەری هەڵدا، ئەوانەش تێکەڵاویی سەما و جمبازن، لە بنەرەتدا لەسەر ئاوازی موسیقای جاز و سەمای ئەمریکییە رەشەکانەوە دروستبووە. جوزیف باکری هونەرمەند بە بەژنە نازدارەکەی سەمای شارلستۆنی بۆ جاری یەکەم لە پاریس نمایشکرد.

## گەشەی مۆدەکان

کە دەچوویتە ناو فارگۆنەکانی ئاوازی خۆشی گۆرانیت دەبیست، بەو ئاوازە تازانەوە دەیانووت:

تکایە ئێمە رازی نین، نامانەوێت قژمان مەبڕن، ئەوانەی دەخوازن قاچمان درێژتر دیار بێت.

ئەو ژنە سترانبێژانە فستانی درێژی رابواردنیان لەبەربوو، تا ناوقەدیان رووتبوو، سینگیان بە زەحمەت کەمێکی داپۆشرابوو. لە سالانی ١٩٢٥ و ١٩٢٦ مۆدەی تر، بە پێچەوانەی ئەوانە هاتنە نیشاندان، ئەو مۆدانەش تەسک و باریك بوون، ئەو مۆدەیەش زۆر لەلای نەخشەسازانی مۆدەکان زۆر ویستراو نەبوون، بەو قژە کورتە و کلاوە گەورەکانی سەریان دەموچاویان دەشاردرایەوە و چاویشیان بزردەبوون، بەو شێوەیە ئاکاریان لە جەرەسێك دەچوو، ئەوە لەلایەك لە لایەکی ترەوە مکیاژەکانی روویان و لێوی سوور و پۆدرەی روومەتیان و چاوەکانیان و ئیکسسوارە راستەقینە و شاراوەکان، غلیۆنە درێژ و بۆیە سووری ئینۆکەکان بەیەکەوە دیکۆر و شێوەی فارگۆنەکانی ترێنە خێرایەکەی تەواوکردبوو.

سەباردت بە شۆخی پیاوانیش ئەوانیش سیمای تایبەتییان هەبوو، لەژێر پالتۆکەیان ستردیەك لەبەردەکرا، چەکمە پیستییەکەی ئەوییەکەی پێیان و کلاوە ناسکەکەی سەریان و سترد ناسکەکانی شەوانە و شەروالە درێژەکانی نووستن یاخە و سەردەستەکانیان یەکپارچە حریری سادەبوون. مۆدیلی سمێلیش جێگەی ریشە درێژەکانی گرتبۆوە. روومەت کراوەی بەدەرو قژ راستیش مۆدەی رۆژبوون. مۆدەی زۆری تازە پەیدابوون، ئاخاوتنیش شێوەی گۆڕا، دەستەواژەی ناسك و رەنگین بەکارهاتووە، باسی خەون لێکدانەوە و باسی لیبیدۆ و گرێیەکی ئودیب و رەشبینی و یەکبوونیش دەکران.

# ترێنی شارستانیەکان

لەسەر ئەو ترێنە چەندین شارستانی و کەلتوور کۆدەبوونەوە، ئەوەش نیشانەی جیهانگیری ژیان بووە، ئاهەنگەکانی شەوانە دەکران ڕێکوپێکی کەمی پێوەبوو، هەموو بەربەستەکان دەڕووخا و هەموو بەیەکەوە ئەوەیان دووپاتکردیتەوە، ئەویش ئەفرەتێك بوو لە سەدەیەکی زەمەن. هەموو بەهاکانی نیشتیمان و ئایین و خێزان و یاساکانی جوانی لێرەوە دیاربوو. لەو شوێنەدا چەندین وشەو دەستەواژە و بیر و هزر و دەبینرا و بزریش دەبوو، هونەریش سەرلەنوێ تێدا دەخەملییەوە، کالای دروستکراو لە داری کرانبەها و هونەرساز و بە دیکۆر و نەخشەی جوانی بە وێنەی گیانەوەر و ڕووەك و دار و گوڵ و چەندین جوانکاری دەبینرا. کەلۆپەل و کەرەستەکانیش لە ماجورال و شووشە لەلایەن برایانی دومی شارەزا لە شووشە و کارمەند لە مەڕمەڕ و ئەمیل غالی و خوێندنگای نانسی دروستکرابوون، ئەوانەش هونەرەکەیان لە کەلتووری ژاپۆنی و خۆرهەڵاتی خواروو وەرگرتبوو.

ئەمیل غالی لە نووسینەکانی بەناوی سروشت سەرچاوە و ئیلهامی یەکەمی هونەرە، نووسیویەتی:

هونەرکاران بۆ جوانکاری شتەکانیان تێبینییان تەنها لە خاڵەکانی بەیەکگەیشتنەوە بۆ دیمەنە نەخشسازییەکانی وەرنەگرتەوە، جوانیەکانیان لە هێڵە سەرەکییەکانیشەوە وەرگرتووە. لەو سەردەمەشدا پیشەی تریش پەیدابوو، ئەویش دیکۆرسازیی بوو. ئەندازیاری بیناساز و ڕەنگکار و ئەندازیاری دیکۆر و پیشەساز بە هاوشانی و بەیەکەوە کاریانکردووە، بە هونەری هەموویان ترێنەکەی خۆرهەڵات بە شێوەیەکی نازدار دەرکەوتبوو.

ڕینی برۆ، فارگۆنەکانی بە داری نایاب و کەرەوێتە و مافوور و گڵۆپی برونزی و وێنەی هەڵبژاردراو دروستکردبوو، تابلۆکانی نەخشەکانیش شووشەی تایبەتی لە کوباوە بۆ هاتبوو.

## دامەزراندنی بالیه

لە ساڵانی شێستەکانا بابو باپیرانی ئەنا، کەسایەتییە گەورەکانی ناو ئەو ترێنەیان ناسیووە، سەرجی دیاگیلایف، ڕەمزی شوێنکی پیرۆزی وەك شاری ڤینیسیابوو. لە سانتبیترسبۆرگەوە ویستی ڕووی شارەکەی بەرەو ڕەوتە هونەرییەکان بکاتەوە. ئەو پیاوە ڕووسییە لە پاریسەوە بووە دامەزرێنەری کۆمەڵەی بالیەی ڕووسی، توانی سەماکان بەرەو بواری نوێتر ببات، چەندین هونەرمەندی بەهرەمەندی دۆزییەوە، هەست و سۆزەکانی ڕێگای نەوەیان پێنەگرت، ئەو دەستە هونەرییەی بالیە بەرەو ڤیستفالی هونەریی تەواو ببات! دیاگیلایف هەموو هونەرمەندانی هێنایە سەما و بوونە ئەندامی دەستەکانی، بێجگە لەوەی هەستی جوانپەرستی بەرزی تێدابوو، شەیدا و شارەزایی هونەری مۆسیقاش بووە.

ئەو بەرپرسە دیکتاتۆرە بەهای خۆی دەزانی، ڕێزی خۆی ڕاگرتبوو، بەردەوام ڕووی خۆش بوو، هەستی ساردیشی لەناو هەناوی دەرچووبوایە، بە خۆشەویستی و بە خاوێنی دەردەچوو. لەکەسی قەبوول نەکردووە، کەسیش نەیتوانیوە لەو مەیدانە ڕایگرێت، بە ئاسانی ڕووخۆش و ڕووگرژ دەبوو، وێنەیەکی ئاڵۆزی دەنواند، داخراوی تیژبوو، بێزار و ماندوو خۆشیش بوو، قوربانی دەدا و لەناکاو بەزیوو و بڕوانەکردن بە خودی خۆی نیشان دەدا، زۆر دەگۆڕا و زۆر مەرجیشی دەبوو، بێ سنوور خەونی جوانی هەبوو، وێنەیەکی داخراوی وشك بوو، زیرەکانە کێشەکانی ناو ناوەندە هونەرییەکانی چارەسەر کردووە. لە هەموو دەستەکانی بالیەی جیهان بۆ زانیاری زۆرتر و شارەزایی زۆرتر گەڕاوە، ئەگەر لەگەڵ سەماکەرە ناودارە ئەفسوناوییەکەی نیجینسکی سواری ئەو ترێنە نەبووە، ئەوا لەگەڵ هەردوو سەماکەرە خۆشەویستەکانی ماسین و سارج لیفار سواری ئەو ترێنە بووە.

دیا گیلایف کارسازێکی پسپۆڕبوو، خۆی کارکەربووە، تا سوومەندبن هانی کارکردنی خەڵکی داوە. لە ساڵی ١٩١٤ بەپێی کارنامەی خۆی لەگەڵ سەماکەرە نوێیەکەی ماسین، بە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات سەردانی ئیتالیای کردووە، چەند هەفتەیەك بەیەکەوە ماونەتەوە، ڕەوشەکە ئاهەنگێکی شادی بووە، لەو ئاهەنگەدا گەرمی ئیتالیا و شنەی دەریای تێدا ئاوێتەبووە.

## هاوسەرییەتی هونەری

ئەو گەشتە تەنها پەیوەندی دوو کەس نی یەو بەس، ئەو گەشتە کاروانی هونەری دوو هونەرمەندی گەنج بوو. دیاگیلایف لە فلۆرەنسا شوقەیەکی وەرگرت، ئەگەر (ماسین) شانۆ کراوەکان و ئاهەنگی زەماوەندەکانی زۆر بە تازەیی نیشاندا، بەلام ئەو زۆر لە کارەکانی دیمەنە سروشتییەکان و هونەری نازداری ئیتالیشی بە جوانی پێوە دیاربوو. لە دیتنی مۆزەخانەکانی ئتالی دیاگیلایف زۆرتر هانی دا جولەی هونەری ئیتالی بەرهەمبهێنت.

## خۆری بالیە

**بەڕێوەبەری بالیەی** رووسی زۆر زیرەك بۆ دەستنیشانکردنی بەهرەکان، لە رێگەی **گەڕانەوەیان لەناو** ترێنە خێراکەدا یەکێك بە ماسینی وتبوو، دەکرێ دووبارە تیپی بالیەکە دروست بێتەوە؟

یەکسەر و لەناکاو، ماسین بە نەخێر وەلامی داوەتەوە .. ماوەیەك بێدەنگ بوو، سینگی دەرپەراند و بە ئاکارێکی تری دەموچاوی وتبووی"

ئەگەر تیپی بالیە دامەزرێنمەوە، یەك تیپ دانامەزرێنم، زۆر دادەمەزرێنم، سوێند دەخۆم سەدیش دەتوانم .. ماسین سوێندەکەی لێ نەکەوت و زۆری دامەزراند، بەلام ئەو خۆشەویستییە بەردەوام نەبوو، چونکە دیاگیلایف دەیزانی چۆن لە خەلك جیادەبێتەوە و پشتیان تێدەکات. لەو سالە شێتییەدا تەمەنی لە پەنجاکان بوو، شێوازی رەوشت و مەزاجی ئاسایی بوو، ویستی زۆری بۆ ژیان گۆڕا، قەبوولی نەکرد وێنەی بکێشن، لە ئاوێنەش تەماشای خۆی نەدەکرد. چواردەوردی بە گەنجان دەگیرا، ژانی لەگەل جەستە گەییوەکەی هەبوو، لەبەر ئەوەی چارەسەری باشی وەرنەگرتبوو، بە نەخۆشی شەکر دادنەکانی خواربوون. دەرمانیشی زۆر دەخوارد، بێجگە لەوانەش کۆکایینیشی دەکێشا، بەردەوام دەستی بەدار دەکەوت چونکە گۆپالی بۆ رۆیشتنی هەلگرتووە. زۆرتر خەمگین دەبو ، لە تەنهایی بێزاردەبوو، تا رۆژێك وتبووی من رۆژانە سێ جار پێویستم بە

بەکارهێنانی خۆشەویستی هەیە. جەستەی دیاکیلایف لە جەستەی ئەستێرەیەکی نوسکار وایلدی دەکرد، بەردەوام لەناو ترێنە خێراکەی خۆرهەلاَت ئەوسەر و ئەوسەری بووە، لەنێوان ڤینیا و کوکتو بە سەربازی هاتوچۆی بووە، بەردەوامیش چواردەورەی بە سەربازان گیراوە. لەو سەفەرانەیدا بە زۆری خۆشەویستانی سەردانیان کردووە. ئەویش بە رەوشێکی تەژی چالاکی و جوانی و کارکردن و ویستن بەکاربووە. دیاگیلایف نە کێش و نە زیرەکی و نە دەورە رەهاکەی لە نمایشکردن و سەرپەرشتی چەندین بالیەی رووسی کەمی نەکردووە. ئەو یەك بیری لە مێشکابووە ئەویش دۆزینەوەی نیجنسکییەکی نوێ بوو! لەبەر ئالۆزی ژیانی سۆزداری ئەو بەردەوام هاورێ و هاوویستی مۆدە و خوێندنگانی بووە.

## ترێنە شینەکە

لە ساڵی ١٩٢٤ دیاگیلایف لە پاریس بوو، لە پەنایەکی **شانۆکە بە گۆپاڵەکەی** دەستی خۆی راگرتبوو، تەماشای پرۆڤەی شانۆگەری ترێنە شینەکەی **دەکرد، لە دەرەوەش** بارانێکی خۆش دەباری، شارەکە لەناو شێیە تەڕەکەی بارانەکە و **تاریکییەکەدا توابووە**. لەناکاو ژنە برادەرەکەی گابریل شانل دەستی لەسەر شانی دانا و بە پەنجەی ئیشارەتی بۆ هەرزەکارێك رەوانەکرد، کە زۆر بە جوانی رۆڵی خۆی لە نمایشەکەدا بینیبوو. یەك ساڵ بوو لیڤار هاتبووە رووسیا، سەرەتا رۆڵێکی گچکەی لە ناو ئەو دەستەیە وەرگرتبوو، جان کوکتو پێشکەشی رێکخەری بەرنامەکەی کردبوو، پێناسەشی بە زیرەکی بێ هاوتابووە، ئەو دەمە تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵ بوو. مۆتین وتبووی سیرجی سەماکەرێکە ئێمە بەدوای کەسی وا دەگەڕێین، بیکاسۆش وتبووی، جەستەی ئەو سەماکەرە گچکەیە زۆر گونجاوە.

## ئەستێرەی گچکەی بالیەکە

ئەو گەنجە گچکەیە کە ئەودی رەوشی تایبەتی باش نەبوو لەگەڵ چەند گەنجی تری شاری کییفی شاردزا لە سەما بە ترێنەکەی خۆرهەلاَت رووسیای جێهێشتبوو. لەناو ترێنەکەدا هەستی کردووە چەند لە دیاگیلایفەوە نزیکە، ئەویش لە خۆی و برادەرەکانی

داواکردبوو باسی رووسیا و رۆژانەی خۆیان لەو وڵاتەی بۆ بکەن. لەو رۆژانەی لینین وڵاتەکەی بە پۆلیسی نهێنی تەنیبوو، میللەتەکە لە برسانا دەیناڵاند، شەقامەکانی کیف خەوتوو دیاربوو، بێدەنگییەکی ترسناك گەمارۆی دابوو، لەو شارەدا رێبوارێکت نەدەبینی، باڵەخانەکان لە شوێنەواری کۆن دەچوون. سیرجی شانۆکار لە رۆژانەکەیدا نووسیبووی:

لەو دەمەی وەڵامی ئەو پرسیارەتان لەمن دەوێت، من زۆر بێزارم، تازە هاتووم، وەك ئەوەیە لە لایەکی تری ئەو جیهانەوە هاتووم.

ئەو ئەکتەرە گچکەیە کە چاوی بەو ئەکتەرە سەماکارانە کەوت و چالاکی ئەوانی بینی رەق هەڵگەرا، ئەوانیش چاوەڕوانی وەڵامەکەبوون.

چەند رۆژ پاش ئەو دیدارە بە ترێنێکی ئاسایی بۆ نمایشی چەند بەرنامەیەکی خۆیان لە چالاکیدابوون، بەڕێوەبەرەکەی بالیە رووسییەکەشیان بە ترێنە خێراکە لە پاش ئەوانەوە گەیشتە لایان. سەماکەرە گچکەکە دەیویست زووتر لە پێش چاوی دیاگیلایف نمایشەکەی خۆی بکات، رەزامەندی ئەو بۆ ئەو هونەرمەندە تازەیە زۆربوو، هێشتا ئەندامێکی سادەی دەستەکەبوو، کاری هونەری پێشکەش نەکردبوو، بەبێ ئەوەی هەستی پێکردبێت دیاگیلایف چاودێری کردبوو. لە گەرەکی سەرکەوتن سەماکەرە گچکەکە ژوورێکی بەکرێگرتبوو، لەبەرئەوەی ژوورەکەی بە کەلکی مەشق و پرۆژەکانی نەدەهات، بۆیە بەناچاری لەسەر شەقام و پێش دەرگاکەی نمایشی کردووە، ژنانی هاوسێیەکانی بە شەوقەوە سەیری بەژنی ناسك و جولە جوانەکانیان دەکرد. مانگانەکەی تەنها ۸۰۰ فەرەنگ بوو، لەبەرئەوەی سەماکەرەکان پارەی جلوبەرگی تایبەتی بالیەکەیان لەسەر ئەرکی خۆیان بووە، بۆیە مانگانەکەی بەزەحمەت بەشی کردووە، جلوبەرگی کارمەندانی بالیە رووسییەکە لە تبانێکی رەش و ستەرەیەکی سپیی بە کلانکۆچکەی درێژەوە و گۆرییەی سپی و چەکمەیەکی رەش بووە، ئەوەی پارەکەی لەلایەن تیپەکەوە دراوەتەوە تەنها چەکمەکەبوو، ئەوانی تر دەبوایە ئەو گەنجانە بە پارەی رۆژانەی خۆیانەوە بیکڕن.

پاش ئەوەی لیڤار تاقیکرایەوە رۆڵی کۆیلەیەکیان پێدا کە لای شەرزادەوە دەمرێت.

## شەڕەکانی یەکەمین نمایش

بۆ هونەرمەندان ئاسایی نەبوو لە کاتی نمایشەکانا لەناو هۆڵەکانا ببینرێن، بەڵام لیڤار ئەو دەستوورەی شکاند، لە تەنیشت کۆکتو و مالیەود و براك و بیکاسۆ لە ناو هۆڵەکەدا دانیشت، کە دیاگیلایف ئەو هونەرمەندە گەنجەی لەناو بینەرەکانا بینی، بە رووێکی ناخۆشەوە هوشیاریکردووە، تۆ وا یەك ساڵە لەو تیپە کاردەکەیت، بۆ هونەرمەندان نابێت بێنە ناو بینەران. پاش ئەو تووڕەبوونەش دیاگیلایف کە ژەنینی نوکوردیۆنەکەی ئەوی بینی، چەپلەی گەرمی بۆ لێدا، لە نمایشە تاقیکردنەوەکەی شانۆگەری بیترۆشکا زیرەکی و توانای زۆری پێوە دیارکەوت، بۆیە مامۆستاکەی وتبووی، بۆ کاری هونەری رۆڵی بچووك، گەورەیی نییە. رۆژ بە رۆژ لە کارە هونەرییەکانی سەردەکەوت و گەشەی دەکرد، کە مامۆستاکەی باسی هونەری لەگەڵ دەکردەوە و پرسیار و وەڵامی ئاڕاستەدەکرد، بۆ خۆدزینەوە لەو باسانە دووردەکەوتەوە. نمایشی یەکەمی شانۆنامەکەی ترێنە شینەکەیان لە ۲۰ ی یونیوی ساڵی ۱۹۲٤ لە شانۆی کۆشکی ئالیزیا پێشکەشکرا، ئەو رۆژە بۆ لیڤار رۆژێکی دەگمەن بوو، بە هەموو شێوەیەك ئەو رووداوە هی لەبیرکردن نەبوو. پێش نمایشەکە دیاگیلایف لە شاگردەکەی نزیك ببۆوە بە گوێی چرپاندبوو، لای کەس باس مەکە، من تۆ دەکەمە هونەرمەندێکی گەورەی سەماکردن و بالیە.

## کۆتایی مامۆستایەکە

لیڤار لە چاو هاوڕێیەکانی گەیشتە قۆناخێکی تازە لە مێژووی بالیەی رووسی، لەو سەردەمەشدا مامۆستاکەی نەخۆشی ماندووی کردبوو، نەخۆشی شەکرەکەی ژیانی پێ تاڵ کردبوو، بۆیە زۆرتر لە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات سەودای خوێندنەوەو سەیران و گەڕان بوو، لە هاوینی ساڵی ۱۹۲۹ لە شاری ڤینیسیا تەندروستی زۆر خراپ بوو، لەو ردوشەدا کەسی بەدەستەوە نەما تا خزمەتی بکات، بەڵام لیڤار لە تەنیشتی مایەوە و بەشداری رۆژە ناخۆشەکانی دەکرد، باسی رۆژانەی گەنجی و گەشتەکانی بۆ دەکرد، زوو زووش

گۆرانی ئەباتیتیکی تشیکوفسکی بۆ شاگردەکەی دەچڕی، هەموو خەونەکانی بۆ گێڕایەوە، سەرکەوتن و هەرەسەکانی بەبیردەهاتەوە.

دوو شەوی تەواو قدیسی کاسۆلیکی لە تەنیشتی مایەوە و لە بەیانی ١٠ی ئوگستیدا دیاگیلایف کۆچی دوایی کرد، سیرجی لیڤار و بوریس کوشنۆ لە تەنیشتیەوەبوون. بەدەرکەوتنی خۆری بەیانییەکە هەموو برادەرەکانی فرمێسکی ماتەمینیان بۆ کۆچی ناوادەی ڕشت، هێشتا زۆری مابوو، تەمەنی ٥٧ ساڵی تەواونەکردبوو، بۆ لیڤار و بوریس مامۆستا و پشتیوان بوو، بۆیە ئەوان لەهەموو ئەندامانی دەستەکەی خەمی مردنیان خوارد و سەریان بەیەك ودنا و بە گەرمی بۆ ڕۆیشتنەکەی گریان. هەموولایەك بۆ بەرێکردنی تەرمەکەی ئامادەباشیانکرد، لیڤاریش لەناو کۆشی خەمەوەو لەگەڵ دەستچوونی مامۆستاکەی دەستەکانی لەسەردانا و بۆ شووشتن ئامادەی کرد.

## بۆ وەسفی ئەو دیمەنانە نووسیویەتی

لەو ڕۆژەدا بۆ کۆچی دیاگیلایف ئاسمان شێوا و دونیا وەرکەڕا، ئەو ساتە هەموو کاروان و ڕۆژانەی منی گۆڕی، چونکە ئەو مامۆستا و هاوڕێ و ئاسیار و پشتیوانم بوو. ئەو شەوە لیڤار خەوی لێنەکەوت، بەیانییەکەی بە بەلەمێکی گەورە لەناو ئاپووردیەکی زۆرەوە بەرەو کەنیسەی کاسۆلیکی یونانی ڕۆیشتن و پاشان بۆ گۆڕستانی رووسەکان لە دوورگەی ئایزولا دی سان میشال بەرێکەوتن. کۆشنۆ و لیڤار لە سێیەمین پێگەی ڕێورەسمەی تەرمەکەبوون، ئەگەرچی هەرگیز بەیەکەوە نەبینرابوون، مردنی ئەو لەناو مێشکیان کارەساتێکی گەورەبوو، هەتا هەتایێ بیرەوەری و یادکاری هەڵکۆڵی. دووبارە لیڤار سواری ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات بۆوە، بەڵام بێ ئەوەی مامۆستاکەی هاوڕێی بێت، گەشتەکانی ئەو بە ئەمری لای ئەو ماونەتەوە، ترێنەکەش هێمای هەڤاڵبەندی هونەری و هەستی ناسکی پیرۆز مایەوە.

## ترێنی مارلین دیتریش

ئەناو کای مێردی لەسەر ئەو ترێنە باسی دیاگیلایفیان دەکرد، ترێنەکە راوەستا، ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە پەنجەرەی ترێنەکە بە خێرایی دەهاتنە پێش و دەیانویست زۆرترو باشتر ناو ترێنەکە ببینن.

ژن و مێردەکە دەیانزانی هونەرمەندی ئەلمانی (مارلین دیتریش) یش رێبواری ئەو ترێنەبووە، بەڵام ئەو بە بەرنامەو زۆر نەهاتووە. حکومەتی ئەلمانی لە ساڵی ۱۹۱۹ هاتنی ئەو ترێنەی بۆ ناو وڵاتەکەی راگرتووە، هەروەها پاریس و پراگ و سۆفیاش لەبەر کۆنی مەکینەکەی و خراپی هێلەکەی و کەمی سوتەمەنی بواری هاتنی ئەو ترێنەیان نەداوە. ترێنەکە بۆ گەیشتن بە ڤیینا بە سویسراو نەمساوە رۆیشتووە، ئەو ترێنە بەو شێوەیە کاریکردووە، تا لە نۆڤمبەری ساڵی ۱۹۲٤ دووبارە هێلەکەی ئاسایی بوویتەوە.

## سێکس و شۆڕش

پاش شۆڕشی سپارتاکی دیاردەی سەمای رووت و یاری ترسناك لە ئەڵمانیا پەیدابوو، هاوشانی ئەو دیاردەیەش تیرۆری سیاسیش زۆربوون، شەقامەکان بۆنی خوێنیان لێ دەهات، سێکس و کوشتن لەیەك نزیك بوون، نزیکییەکەش وەك سێبەر و جەستەی مرۆڤ وابووە، ژنان لە شۆڕشێکی سێکسیدا ئامادەییان هەبوو لەشفرۆشی بکەن بۆ ئەو کەسەی زووتر داوای بکات. شەقامەکانی بەرلین بەردەوام ئەفیشی رووتی پێوە دەمایەوە، لە یەکێك لە ئەفیشەکان وێنەی ژنە سەماکەرێکی رووتە و لەگەڵ پەیکەرێکی ئێسك سەما دەکات، لە ژێرەوەشی نووسرابوو (بەرلین مردن هاویەشیت دەکات)!

لەلایەکی تر ژمارەی سینەماکانی ئەڵمانی لە ۲۰۰۰ سینەما زۆرتربوون، ژمارەکەیان گەیشتە ٤۰۰۰ سینەما، ژمارەی بەرهەمهێنانی فیلم گەیشتە ٦۰۰ فیلم، بۆیە ئەلمانیا پێویستی بە ژمارەیەکی زۆری کارمەند و ئەکتەری بە ئەزموون هەبوو.

هەموو کارمەندانی بواری سینەما لە ساڵی ۱۹۲۲ باسی مارلین و رووە ساکار و جوانییەکەی و هەردوو قاچە داتاشراوەکەیان دەکرد، ئەو کیژە ناسکە بەهرەی شاراوەیی

زۆری تێدابوو، بۆیە پێویست بوو بە ناکابهێندرێتەوە، تا رەونەقی گەشتربێت و هونەرەکەی گەشاوەتربێت، دەبێ فتیلەکەی داگیرسێت، بە کورتی ئەو نموونەیەکی دەگمەنە و زۆر جیاوازە.

بەشداری لە شانۆگەری (لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی تر) دەکرد و دەگەڕایەوە مالّی مێردەکەی، زۆر بە زەحمەتی چەند هاوڕێیەکی لە یانەکانا پەیداکردبوو، جاروبارێش لەگەلّ ئەوان شەوان دەچووە دەرەوە، زۆریش لەگەلّ ئەوانە دەمایەوە کە کەمتر لە پێنج سالّیان لە زیندانا نەبردبێتە سەر.

## ئەستێرەی بەرلین

**لە شانۆ تەنها ئەو ئەستێرە** نەبوو، ئەستێرەی پرشنگداری ئەو بوارە کلارا والدورف **بوو، ئەو لە گۆرەپانی هونەری** بەرلینا بێ هاوتابوو، کەسی تر هاوشانی ئەو نەبوو، وەك **گۆرانبێژ و سەماکەر** و خەوین، بە قژە سوورەکەی و بە بەژنە زراڤە لووسەکەی ناسرابوو، **بۆیەش** بە منارە ناویان هێنابوو، دەنگێکی پیاوانەی دڕی هەبوو، زۆری بۆ مارلین خوێند و یارمەتی دا، زۆر باسی گەشتەکانی بۆ ئەستەنبۆلّ و پراگ و بودابستی بۆ کردبوو.

مارلین ئەگەرچی کیژێکی تەمەن سێ سالّ و نیوی لە مێردەکەی هەبوو، زۆرشی خۆشدەویست و زۆریش وتویەتی:

ئەو یەکەم و دوا خۆشەویستی منە و سۆزم تەنها بۆ سەر سینگی ئەو هەیە.

بەلاّم مارلین حەزی لە ئازادی زۆرتر هەبوو، هەستی بە داگیرکردن و زیندانی مالّهی مێردی کردووە، شەیدای ئەوە بوو لە دەستی رابکات و سەربەستانە بژیت. رودی یود مارلینی بە کێشەی یەکەمی خۆی دەزانی، هەموو شتی ژیانی ئەوبووە، کە رازی دلّی بۆ کردەوە نیگەران بووە، ژن و مێردەکە لەناو گومان و بیرکردنەوە سەریان لێ شێوابوو، لە دووریانا بوون، زۆر بەیەکەوە بیریان کردەوە و لە کۆتاییی کەوتنە پێکەنین.

رودی ئامادەبوو ژیانی لەگەلّ خۆشەویستەکەی و ئەستێرە خۆشەویستەکەی هاوولاّتییان بەش بکات، تەنها ژیانی بە هاوسەری ئەو ویستووە، لەکاتی خۆکۆکردنەوەی

بۆ رۆیشتنی زۆر بە گەرمی کەوتنە دەمەقاڵێ و شەڕیان بوود، لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٢٨ لە سەمای شارلستۆنا دیداری وێلی کردبوو، بڕیاری دابوو بەیەکەوە بڕۆن و مێردەکەی جێبهێڵێت. کە مارلین لەگەڵ دۆستەکەی بە ترێنەکە رۆیشتن هەواڵەکە زوو بڵاوبۆوە، ئەو هەواڵە ژیانی رودی مێردی مارلینی لە بنەو بناغە گۆڕی، ئەو خەونی ئەوەبوو بەیەکەوە ئارام بژین، کار بۆ ئەوە بکەن لە دەرەوەی بەرلینیش ئەو بناسرێت.

مارلین تایبەتی بۆ خۆی دەژیا، کەمتر ئاگاداری کاروباری ماڵەکەی بوو، شیعری دەخوێندەوە و پرۆڤەی لەسەر شانۆنامەی نوێ دەکرد، لەسەربانی قاوەخانەیەک شوێنێکی تایبەتی بۆ خۆی تەرخانکردبوو، لەو هەورازە چاوی لە رێبواران دەکرد، بەو دیمەنە زۆر تایبەتیانە سوودی لە رۆڵی خۆی لە شانۆنامەکانی دەبینی، پێویستی بەکەس نەبوو رۆڵەکانی بۆ بەرجەستە بکات، ئەو خۆی دیمەنە راستەقینەکانی رۆژانە و بەردەوام دەبینی. لە ماڵەوەش مێردەکەی وەك تارماییەك دەهاتە پێش چاوان، لە گۆشەکانی ماڵەوەیان لە پێش چاوانی ئامادەییان هەبوو، بۆیە لەو گۆشەیە کارە هونەرییەکانی گەشەپێدەدا. پاش ئەو گۆڕانە لەناکاوەی ژیانی هاوسەرییان پیاوەکە تاقەتی کاری نەما، رەزامەندی نیشاندا بەیەکەوە لەگەڵ هاوڕێیەکەی بۆ ڤیینا بڕۆن، بەڵام ئەمجارە بە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات سەفەربکەن.

## مارلین لە ڤیینا

مارلین دەزگایەکی لە ڤیینا لە ساڵی ١٩٠٣ دروستکرد، لەو شوێنە چەندین ئەندازیارە نیگارکێش و کارمەندی دیکۆر هاتنە سەردانی، لەوێ گوێی لە سیمفۆنیای نویەمی بتهۆڤن راگرت، لەبەردەم باڵەخانەی توتر وانرەوە بەرەو بازاری ناشمارکت رۆیشتن، لەو بازارە شوێنی تایبەتی هەموو خواردنەکان هەبوو، وەك سرکە بە هەموو جۆرەکانی و پەنیری هەرچوارلای جیهان. لە گۆشەیەکی لاچەپی ئەو بازارە ویلی و مارلینی دۆستی بەیەکەوە دانیشتبوون، بەیەکەوە بیریان لە دوارۆژی خۆیان کردەوە، گەیشتنە ئەو راستییەی ئەو ترێنە کێوەیان دەبات، ئەو ترێنە رەمزی ئەورووپای پیرە، با بیر لە

سەرچاوەیەکی ترو مەنزڵێکی تر بکەینەوە، تا لەو جیهانە زۆرتر کاربکەین و زۆرتر ببینین، ئێمەش وەك ئەکتەرە سویدی گرێتا گاربۆ بکەین بەرەو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا برۆین، ئەو لەوێ گەیشتە هۆلیۆد، بەڵام مارلین بەرنامەی ئەوەبوو پێش سەفەر خۆی دروست بکات، پێبگات، بیری لە سەفەر نەدەکردەوە.

لەسەر خوانی نانخواردنی ئێوارەدا ویلی مارلینی بە رۆژنامەنووسێکی ئەمەاوی بە ناوی بیلی ویلدر ناساند، ئەگەرچی تەمەنی بیست ساڵان بوو، بەڵام زۆر لە رێبوارانی ئەو ترێنەی ناسیوە و زۆریش لەسەر دەزانی، چیرۆکی کەسایەتییەکانی ناو فارگۆنەکانی ئەو ترێنەی زۆر دەزانی، بە زانینی ئەو چیرۆکە جوان و بە شەوقانە توانی ببێتە باشترین و گەورەترین سیناریۆنووسی هۆلیۆد.

## ناسینی بریمارك

مارلین گەنجێکی نووسەری بەناوی ئاریك ماریا ناسی، هانی دا رۆمانێکی نوێ بەناوی هیچی نوێ لە دیوەکەی خۆرئاوادا نییە .. بنووسێت، ئامادەبوو و نیازی چاپیشی بەناو خواستراوی ئەیریك ماریا ریمارك هەبوو. ئەیریك هەستی بەوەکرد مارلین زۆر لەو ئەستێرانەی سینەمای بەرلین و ساڵە گەرمەکانی جوانترو شەنگترە. تا ئەو دەمانە هەستی نەدەکرد، رۆژێ دێ ئەو و مارلین زۆر بەناوبانگ دەبن و خۆشەویستییەکی گەورەش بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە. ژیانی مارلین و چالاکی و سەفەرەکانی بە ترێنەکان و فیلمەکان و کیژەکەی و دۆستەکەی و مێردەکەی و عەشقی بۆ ئەدەب، ئەوەی بەشێکی کردە شانۆ، هەمووی لە ژیاننامەو کەسایەتی رەنگی دابۆوە، ئەوەش پەیامی تایبەتی گەنجێکی مۆدێرنی مێینەیە، سەبارەت بە رەتکردنەوەی داب و نەریتە برژواکان، لە پەیوندی بە پیاوانیشەوە هیچ شەرمەزارییەکی نەبینیووە. ئەو ژنە زۆر حەزی کردووە شەوانە بەشداری ئاهەنگەکان بێت و دوور لە چاوی مێردەکەی لە ماڵەوە لە تەنیشت ویلی دۆستیشی نەبینرێت. کە ویلی زۆر هاتە ناو کێشە تایبەتییەکانی هەستی بە بێزاری و نارەحەتی کرد، بۆیە کەمتر بەیەکەوە دەردەچوون، بە ئوتومبێلی بەرهەمهێنەرەکە لە ستودێوە

دەگەڕایەوە ماڵەوە لای مێرد و کیژەکەی. مێردەکەشی کامیرایەکی کڕیبوو، ڕۆژانەی وێنەی ژنەکەی و کیژەکەی لە سەفەرەکانا وەرگرتبوو، پاشان کردبوویە فیلمێکی کورت بەناوی دایکێکی بەختیار و لە چەندین سالۆنی ئەلمانی نیشاندران.

## تەڵەکانی ئەڤینداران

ویلی تەڵەیەکی بۆ مارلینی دۆستی دانایەوە تا بیگێڕێتەوە، داوای لێکرد لە وێنەگرتنی فیلمێك پێویستیان بە چەند دیمەنی ناو ترێنە خێراکە هەیە، ئەگەرچی بەرهەمهێنەرەکەشی بەو تەڵەیە رازیکردبوو، بەڵام لە کۆتایی سیناریۆیەکە بواری ئەو دیمەنەی نەدابوو بۆیە بیرۆکە هەڵوەشایەوە. کە پەیوەندی بە ویلی نەما رۆڵی لە فیلمەکانیش نەما، هەر ئەوەندی لەدەست مابوو رۆڵە کورتەکانی رودی ببینێت، ئەوەش رووخان و شکستییەکی هونەری بوو، رودی دڵی دەدایەوە و موژدەی ئەوەی دەداتێ ژیان رێکەوت و گۆڕانی تازەی زۆری دێتە پێش، ئەو ناوبانگییەی پەیدایکردووە بوارسازە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری لە کاتە ناخۆش و تەنگەکان. لە دانیشتنێکی تایبەتی لەگەڵ دوو هاوڕێ تر بوون، کە پێشنیاری بەشداریکردنی لە فیلمێکی گرنگیان بەناوی (جازبیەی فریشتەی شینەکە) پێووتبوو، بەو داوایە و ئەو پێشنیارە زۆر دڵخۆش بوو، ئەو بە رۆڵێکی کورتی بچووکیش رازی بوو. دەرهێنەری فیلمەکە هونەرمەندێکی نەمساویی بوو، ناوی جوزیف فۆن سترنبرگ بوو، لە منالییەوە لە ئەمریکا ژیابوو، فیلمەکانی لە هۆلیۆد ناوبانگ و سەرکەوتنی باشیان هەبوو. لەبەر ئەوەی ئەو فیلمە پارەیەکی زۆری هاوبەشی ئەلمانی ئەمریکی بۆ دانرابوو، بۆیە رەچاوی سەرکەوتنی باشی لێوە دەرکرا لە مێژووی سینەمای ئەلمانیدا، ئەو فیلمەش دەبێتە یەکەمین فیلمی ئەلمانی گۆرانی ئامێزی نێونەتەودیی، کە دیمەنەکانی لە ڤیینا گیرابێت.

# گەڕان بە دوای ئەستێرەیەك

دڵی بۆ ریجستۆرەکە و فیلمەکە لێدا، ئەوەش فەرسەتێك بوو، تا دووبارە سواری ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتەکە ببێتەوە، بەڵام کە گەیشتەوە ماڵەوە و چاوی بە کیژەکەی و پیاوەکەی کەوت پێشنیاری فیلمەکە و بیرۆکەی لەبیر نەما. ئەوانە دەرەنگ دەنووستن، کاتی زۆری بۆ کیژەکەی دادەنا و هاوکێشەی ژیانی رادەگرت.

دوو هەفتەبوو خۆی بۆ نمایشێکی شانۆیی ئامادەدەکرد، لەناکاو ریجستۆر جوزیف فۆن سترنبرگ یاریدەرەکەی و ژنەکەی پەیدابوون، ئامادەبوونی ئەو کەسایەتییە هونەرییە هیچ ترس و نیگەرانی بەو نەبەخشی رۆڵەکەی خۆی بە جوانی و بە ئاسایی بینی. سترنبرگ بەدوای ئەکتەری مێینەی سەردانی بودابست و ڤیینا و بەرلینی کردبوو بۆ دۆزینەوەی ئەکتەرێکی شیاو تا رۆڵی لە فیلمەکەی ببینێت. کە کیژەکەی بینی، سەرنجی راکێشا بە یاریدەرەکەی وت، ئەومیان باشە، ئەو لەوەڵامدا وتبووی، تۆ لە دەموچاوێکی سینەمانی دەگەرێیت ئەومیان رانەکانی جوانن! شانۆگەرییەکە باش و خۆش نەبوو، بەڵام سترنبرگ لە ناوەکەی پرسی، ئەگەرچی رۆڵەکەشی باش نەبوو، بۆیە ئەو بە یاریدەرەکەی وتبوو، رێنمایی داهێنانی کەمە! ریجستۆر و ژنەکەی چوونە پشتەوەی پەردەکە تا هونەرمەندانی ناو بەرهەمەکە ببینێت، مارلینی داواکرد، تا رووبەروو سەرسامبوونی خۆی بە رۆڵەکەی پێ بڵێت. بۆ بەیانی نامەیەکی تایبەتی لە جوزیف فۆن سترنبرگ بە دەست گەیشت، لە نامەکەدا داواکاربوو لە نووسینگەی خۆی بیبینێت. بەو نامەیە مێردەکەی هاواری کردە ژنەکەی و وتی:

دیارە بە رۆڵەکەت سەرسام بووە، لە سیناریۆکەی رۆڵێکی بچووکت بۆ دادەنێت!

کاتی دیدارەکە هات، رووبەرووی وەستا، بە ترس و دڵەراوکێییەوە لە تەنیشت هونەرمەندی ناودار ئەمیل جانیینفس و یاریدەری نووسەری سیناریۆکە و بەرهەمهێنەرەکە دانیشتبوو، لەوانە تەنها سترنبرگ روو بە بزەبوو، ئەوەش نیشانەی رەنگدانەوەی باش و رازیبوونی پێوەبوو.

## گەشانەوە

مارلین لە کاتی نمایشکردنی رۆڵەکەی لە شانۆگەری (بروداوی) دا هەستی بەوەکرد، سترنبرگی دەرهێنەر ئەوەندەی بە بەژن و دەموچاوی سەرسامە، ئەوەندە بایەخ بە رۆڵەکەی و دەنگی و نمایشەکەی نادات، پاش تەواوبوونی نمایشەکە داوای لە یاریدەرەکەی کرد بەیەکەوە بچنە ژووری جلوبەرگ و خۆگۆڕینەکە، تا زۆرتر سەرنجراکێش بێت جلێکی ئاوریشمی ئارامی جوانتر لەبەر بکات.

مارلین پیانۆیەکەی کردەوە و پارچە مۆسیقایەکی ژەنی، سترنبرگ ژەنینەکەی زۆر لا خۆش بوو، بینی ئەو ژنە پەنجەکانی لەسەر پیانۆکە زۆر زیرەکانە بەکاردەهێنێت، مارلین کە زانی ئەو ئاوازەکەی لا خۆش بوو پارچەیەکی تری (باخ)ی ژەنی، لەو دەمانەدا ئەوەی بەبیرهاتەوە کە دواجار لەسەر ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات ئەو ئاوازەی ژەنیووە، بە ئارامی لەسەر پیانۆکەبوو، دەرهێنەرەکە دیارە دەرەنگی بووە، بۆیە هەر چاوی بەسەر سەعاتە زیوینەکەی دەستی بوو، بۆی روونیش بۆوە ئەو ژنە زۆر لە مۆسیقای کلاسیکی شارەزایە.

سترنبرگ زۆر بە کلۆفەوە چاودێرانی ئەکتەرەکەی دەکرد، کە زۆر بە پۆشتەوە لە کۆشەیەکی ستۆدیوکە بینی، کامیراکەی راگرت، رەزامەندی خۆی لەسەر پرۆڤەکە نیشاندا و بەپەلە بەرەو رووی چووە پێشەوو پێوت:

ئەو بەیانییە گۆرانییەکی نوێیت بۆ دۆزیمەوە.

لە وەڵامدا تەماشای چاوی کرد. بۆیە ئەویش هەستی کرد راکێشانی ئەو کیژە زەحمەتە، وا باشە زۆر بەرێزەوە خۆی بنوێنێت.

پاش نیوەرۆیەکەش سترنبرگ و تیمەکەی و بەرهەمهێنەرەکەی ئامادەیی دووەمی پرۆڤەکە بوونەوە، هەموو لەسەر ئەو بریارەبوون ژنە ئەکتەرێکی تر بەناوی لۆسی ماناحیم وەرگرن، بەڵام سترنبرگ بریاری دا لە فیلمێکی نوێتری رۆڵی (لولا لولا) بداتە دیتریش.

وێنەگرتنی فیلمی فریشتە شینەکە بۆ تیمەکە زۆر ئاسایی نەبوو، بەڵام مارلین هەستی بە سەرکەوتن کردبوو، بریاری ئەوەشی وەرگرتبوو پەیرەوەی زیرەکی سترنبرگ لە کارا بکات. سترنبرگ لە رۆژانەی کارکردنیدا زۆر رێکوپێك بوو، داوای نمایشی وەك پێویستی

دەکرد، کە پرسیاری ئەوەی لە مارلین دەکرد، لەو ساتانەی کاریان لەگەڵ دەکات هەست بە چی دەکات، بێزار دەبوو، بە هەڵەیەکی بچووك داوای دووبارەکردنەوەی دەکرد، ئەنجامەکەی هەموو جارێك لەسەر شاشەکە جوان دەبینرا. پێش ئەوەی نیشاندانی یەکەمین نمایشەکە ببینێت سترنبرگ بەرەو ولایەتە یەکگرتووەکان سەفەری کرد، زۆرتریش رۆیشتنەکەی بە هاندانی ژنەکەی بوو تا لە مارلین دووربکەوێتەوە، بەڵام پێ رانەگەیشت.

بۆ سترنبرگ و مارلین روونبۆوە لە کاتی فریشتە شینەکە و پاشانیش قۆناخێکی تر پەیدابوو. کە نانی ئێوارە و خوداحافیزییان بەیەکەوە خوارد، ئەو دەرهێنەرە ناودارە وێنەکانی ماڵئاواییەکەی بە رێکی وەرگرت. مارلین بە پوختەیی وەڵامی دایەوە، تۆ گۆشەکانی ژیانمت وەرگێڕا. گوارەکانی لە گوێیەکانی کردەوە و لە نێو پەنجەکانی دانا، وتیشی ئەوەیان دیاری لەدایکبونیەتی دایك و باوکی بۆیان دانابوو، هیواداریش بوون رۆژێ بێت بگاتە دەستی، کە کیژەکە لەدایکبوو، دیارییەکەی وەرگرتووە. لە دەرچوونی بۆ دەرەوە و رۆیشتنەوەی، لە نێوان مێزەکانا بەردەوام سووکە ناوری نازی دەدایەوە و چاویان فرمێسکی نیشانی سترنبرگ دەدا، ئەویش بزەیەکی شاراوەی بۆ دەنارد.

## سەرکەوتنی فریشتەکە

فیلمی فریشتە شینەکە لەیەکەم رۆژی نیشاندان سەرکەوتنی زۆری بەدەستهێنا، بۆیە مارلین بە رودی مێردی راگەیاند پێش کۆتایی ئەو مانگە وا باشە سەفەری هۆلیوود بکەم. رودی مێردی ئەو قسەیەی بە ژانەوە وەرگرت، ناڕەزایی زۆری پێوەدیاربوو.

مارلین دەیویست بە زووترین کات بگاتە سترنبرگ، ئەو رۆژەی ئەو بڕیارەی دا تازە رۆژانی یەکەمی نیشاندانی فیلمی فریشتە شینەکەبوو لە شارە گەورەکانی ئەڵمانیا، چاوەڕوانیش بوون پاش سێ هەفتەی تر لە پاریس و لەندەن و رۆماش نیشان بدرێت، بەڵام ئەو چاوەڕوان نەبوو، سترنبرگ پێیووتبوو ئەگەر کارێکی هونەری لەیەك شارە سەرکەوت پێویست ناکات چاوەڕوان بیت، لە شارەکانی ترا بینەران خۆیان ئەو بڕیارەی لەسەر دەدەن، حوکمی ئەوان بەسە.

مارلین لە پەخشی شاری بەرلین ئامادەبوو، هەر ئەو شەوە لە ماڵەکەی دەرچوو، رودی دڵی شکا بەرگەی ئەو رۆیشتنەی نەگرت، دۆستەکەی جارانی ویلی تا ئێستگەکە لەگەڵی رۆیشت، وتی:

کەواتە هۆلیۆد هەموو رۆژە خۆشەکانمان بۆ قەرەبوو دەکاتەوە ..و .. لە باوەشی گرت و ماچی کرد، وایدەزانی ئەورووپای کۆن و ترێنە ئەفسوناوییەکان و وڵاتەکەی و خێزانەکەی لە ئامێز دەگرێت.

مارلین لە ئێستگەی بریمرهاڤن سواری باشترین پاپۆری ئەو رۆژە بەناوی بریمن بوو. سترنبرگ گرێبەستێکی باشی لەگەڵ بارامونتی بۆ سازکردبوو، بەپێی ئەو گرێبەستە ساڵانە لە دوو فیلم کاربکات و خۆشی سەرپشك بێت لە هەڵبژاردنی ئەو ریجستۆرەی ئەو حەز دەکات کاری هاوشانی بکات، بەوەش ریجستۆری دەزگایەکی هەڵبژارد بەربەرەکانی میترۆ گولدوین مایر بکات، ئەوەی ئەکتەر گریتا گاربۆ کاری تێدا دەکات. سترنبرگ داوای لە خۆشەویستەکەی کرد بە شێلان و چارەسەری بارامونت بە ماوەی شەش هەفتە ١٥ کیلۆ لە کێشی دابەزێنێت. لەو گیانبازییەدا خۆشەویستی نێوانیان زۆر بەهێزبوو، چەند ساڵ بە یەکگەیشتنی سۆزداری و هونەری بەیەکەوە ژیان، پاشان هەرکەسەو رێگای تایبەتی زۆری گرتەبەر و بەبێ ئەوەی ساتە خۆشەکانی فریشتە شینەکەیان لەبیر بچێت.

## فرنسیو هۆلیۆد

مارلین دیداری زۆری بە کەسایەتییە ناودارەکانەوە کردبوو، کە لە ناکامی شەڕەکەدا چەندین فەرەنسی گەیشتبوونە هۆلیۆد، لەوانە ریجستۆر جۆن رونوارو رینی کلارو کومیدی جۆن گابان، ئەوەی لە فەرەنسا دیبووی، زۆر بە رۆڵی هونەری ئەو سەرسام ببوو. ئەو مێوانە تازانەی لەبەر خۆشەویستی فەرەنسا و زمانی فەرەنسی لە باوەشی گەرم وەرگرت، یارمەتی نیشتەجێبوون و کارکردنی دان، وەك وەرگێڕ یارمەتیش دەدان، ئەوەندە یارمەتی دان تا خواردنیشی بۆ ئامادەدەکردن. زۆری نەخایاند مارلین و گابان یەکتریان خۆشویست، بەڵام کە شەڕ هەڵگیرسا بۆ بەشداری شەڕەکە گەڕایەوە فەرەنسا. بەردەوام لە نێوان ساڵانی

١٩١٤ و ١٩١٨ گوڵی پێشکەشی گیراوە فەرەنسییەکان کردووە. ئەو وەك بروسیەکی گچکەی کیژە ئەفسەرێکی سوپا گوڵی هەمەرەنگی لە یادی ١٤ یولیو پێشکەشی مامۆستای زمانی فەرەنسی کردووە. مارلین پابەندبوونی راستەقینەی بە وڵاتی فەرەنسا دەربرییوە، ئامادەییشی دەربرییوە هاوشانی چەند هونەرمەندێکی کۆمیدی بەشداری شەرەکان بکات و بچێتە بەرەکانی شەر.

## گۆرانی وتن بۆ بریندار و مردووەکان

رۆژێك وتیان ئەخۆش و برینداره‌کانی ئەلمان دەخوازن ئەو سەردانیان بکات، بەڵام ئەو نەیدەویست، لەبەرئەوەی دەیزانی سەربازانی وڵاتەکەی خۆشیان دەوێت، بۆیە هیتلر خەونی ئەوەی هەبوو بیکاتە پاشای سینەمای رایخ، بۆ بریندارەکانیش بە ئەلمانی گۆرانی چری.

کە شەرەکە هەڵگیرسا مارلین لە ئەمریکابوو، ماوەیەکیش لە گەرمەی شەرەکە لەوێ بوو، نەیتوانی چاوەروان بکات، بەرگەی نەگرت گەرایەوە فەرەنسا. چاوەروانی گابانی کرد کە لە بەرەکانی شەر گەرایەوە، تا بەیەکەوە بژین، شوقەیەکی لە نزیك رووباری سین و تاوەری ئیڤل لە مونتان نزیك قاوەخانەی ناوداری (عند فرنسیس) بەکرێگرت. لەوێ چەندین برادەری پەیداکرد، یەکێك لەوانە ئایدیت بیاڤ بوو، زۆرجار وتویەتی:

ناوی ئەو ژنە بۆشایی ناوی پاریسم بۆ پردەکاتەوە!

لە شەقامەکانی پاریس لەگەڵ گابان پیاسەیان کردووە، بەناو کۆڵانەکانا رۆیشتوون و بە میترۆکەی هاتوچۆیانبووە، وەك چۆن لە هۆلیۆد وەعدی پێدابوو، لە پاریسیش بەیەکەوە زۆر خۆشیان رادەبوارد و زۆریش پێدەکەنین و یادگارەکانیان دەگێرایەوە. دایکی مارلین لە بەرلین مرد، تا پاش شەرەکەش لە ژیاندا مابوو، بە شەرەکە نەمرد خەم کوشتی.

## بەیەکەوە لەگەڵ گابان و همنگوای

مارلین بە حەتیوی لە بیاریتزی دەژیا، لەناکاو هەتیم مایەوە، لەناو ئەو خەم و ژانە پێویستی بەیەکێك هەبوو نازی بکێشیت و رایگرێت، لە هەموو کەس باشتر بۆ ئەو ئەرنست همنگوای بوو. همنگوای و ژنەکەی لە پاریس بوون، سەردان و دیداریان هەبوو، نووسەرەکە بە ناوی (شوکروت) بانگی دەکرد و ئەویش بە بابە ناوی دەهێنا! لەبەرئەوەی شەو و رۆژ بەیەکەبوون، هاوسۆزی هونەری یەکبوون، بۆیە گابان پێشنیاری کرد فیلمێکی هاوبەش بکەن، لە ساڵی ١٩٤٦ فیلمی (مارتان رۆمانیاك) لە بەرهەمی جۆرج لاکومبیانیان کرد.

پەیوەندی مارلین و گابان شاراوە نەبوو، هەموو برادەرەکانیان گەمەیان بە پەیوەندییەکەیان دەهات، بینەرانی فیلمەکەیان گاڵتەیان بە ناوەرۆکەکەی دەهات، کەسەکان و چیرۆکی فیلمەکەیان فەشەلی هێنابوو، لەناو ئەو هەموو ناژاوە و شکانەوە مارلین رازی نەبوو ببێتە هاوسەری گابان، بۆیە ئەویش ناچاربوو پەنا بۆ کیژانی تازەپێگەیشتوو ببات، خیانەتیان لەیەکتریش کرد، پاش فەشەلی فیلمەکەیان نێوانیان زۆر ناخۆش بوو، بەردەوام شەڕیان بوو، لەسەر بچووکترین کێشە دەبووە شەڕیان، لەسەر نەبوونی پارەش کێشەیان زۆرتر دەبوو، بۆیە مارلین بڕیاری دا بگەڕێتەوە هۆلیۆد.

گابانی لەناخەوە هەر خۆشدەویست، خەمی کیژەکەشی بوو، ئەوەی لە شانۆ کاری دەکرد و چەند بڕگە پرۆگرامێکی لە رادیۆش هەبوو.

ماریای کیژی تازە شووی کردبوو، لەو پرۆسەیەی سەرنەکەوت دووبارە شووی کردەوە، ئەمجارە کوڕێکی بوو، مارلین بووە داپیرە، ئەو بووە جوانترین و ناسکترین داپیرە لە مێژووی سینەمادا. لەگەڵ سێ هونەرمەندی گەورەی وەك بیلی و ویلدر و ئالفرید هیتشکۆك کاریکرد، پاش ئەو کارە هونەرییە تازانەی رەخنەگران نووسییان:

هێشتا مارلین نموونەیەکی زۆر بەرزە بۆ رازیکردنی خەونی پیاوان.

مارلین گەیشتە ئەو قەناعەتەی گیانبازی گەورە، دەتوانێ خەونەکانی بە تەنیا و بێ پشتیوانی بەرجەستە بکات. پاش چل ساڵ هەموو کەرەستەکانی کەوتە دەست، مێردی بە رودی کرد و ناوبانگی لەگەڵ ستربنرگ پەیداکرد و خۆشەویستی لەگەڵ گابان کرد.

زۆر پرسیاری له خۆی کردووه، چی ماوه، من لەگەڵ سترنبرگ بە دەنگ و نەکتەری له رووی بینەران گەیشتمە هەرمان، له پێش گەورە ریجستۆرانی راوەستام، نەوانەی وەڵامی زۆر نەکتەری تریان نەداوەتەوە بۆ نەو ئامادەبوون، له رۆژانی شەڕدا خودی خۆی دۆزیوەتەوە.

مارلین له گەشتێکی گۆرانی گوتندا خۆی دۆزییەوە، بواری گۆرانی جیهانی گرت، به دوو روو هاته سەر شانۆ، بۆ پیاوان گۆرانیی وت، به جلی رووت و سەرنجراکیش و سێکسی، بۆ ژنانیش به جلی پیاوانەوە و جگەرەبەدەست بەزمی گۆرانیی گەرمکردووە.

مارلین بۆ زۆر کەسان رەمزی ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات بوو، دروشمی ئەورووپا بووە لەرووی هەموو جیهان، به رەگەز ئەڵمانی بوو، کەلتووردکەی فەرەنسی بووە، هێز و تێگەیشتنەکانی هەموو سنوورەکان و پەیمانەکانی بەزاندبوو. له کۆڤاری (ژین) همنگوای ستوونێکی لەسەر مارلین نووسیبوو، لەو ستوونەدا نووسیبووی:

بڕوا ناکەم کەس هەندی نەو له مانای خۆشەویستی گەیشتوبێت.

له مایوی ١٩٦٤ سەردانی مۆسکۆی کردبوو، لەوێ بە شکۆوە پێشوازی کرابوو، کە لە پێش نووسەر باوستۆفسکی ئامادەبوو، لێوی نەجولا بوو تا یەك وشەی لە زار دەربچێت، لەسەر چۆکان بۆی نوشتاوەتەوە و گریابوو، بەو شێوەیە پێشوازییەکەی وەرکرت. لەبەرامبەر جەماوەرەکەیدا له ئاهەنگێکی گۆرانیدا بێ وەستان ماوەی چل دەقە چەپڵەیان بۆ لێدابوو، لەوێ وتبووی:

لەمێژە ئێوەم خۆشدەوێت، چونکە ئێوە بە دڵشادی، بە خەمگینییەوە نەوەندە دەزانن و تەنها گوزارشت به هەستتان بکەن، من ئەو رووحە سلافیەم بە گەورەیی و راستگۆیی و جازبییەوە پێوەیە.

لەو رۆژەدا، به زاری خۆم گوێم لێبوو ناوی ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتی هێنابوو، کە وتبووی:

نەو دەمەی نەو ترێنە چوویتە مۆسکۆ، تەمەنم ١٣ ساڵان بوو.

# ترێنی گیانبازی و جاسووسەکان

ئەو ترێنە لە چارەگەی یەکەمی سەدەی بیستەم بۆ چەندین ساڵ چەتری خۆشاردنەوەی گیانبازان و جاسووسانی هەموو وڵاتان بووە، کەسایەتییەکی نامۆ بە ناوی ئەلکسندر بارفۆس سواری دەبوو. ئەو پیاوە بازرگانێکی دەوڵەمەند و شەڕوانێکی بەجەرگی ڕۆژانەی شۆڕشی رووسی ساڵی ١٩٠٥ بووە و هاوڕێی ترۆتسکیش بووە. پیاو و پلەدارێکی شیاوی بەرژەوەندی هەواڵگری ئەڵمانی بوو، کابرایەکی سەرنجڕاکێش و شۆڕشگێڕ و فێڵباز بووە. هەستی بە بەبوونی دوو کەسایەتی کردووە، بۆیە تووشی شیزوفرینیای سیاسی هاتبوو. ناوی راستەقینەی هالفۆرد بووە، لە ساڵی ١٨٦٧ لە خێزانێکی هونەرمەند لەدایکبووە، بە رەچەڵەك دەگەڕێتەوە سەر ئیمپراتۆرەکانی قەیسەرییەکان. لە زانکۆی (برن) و پاشان لە زانکۆی (سویر) خوێندوویەتی، لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە شاهیدی کۆمەڵکوژییەکەی رووسەکان بووە، رەمزی خراپە و بەدکاری و کاردانەوەیەکی لە جیهان بۆی پەیدابوو.

بارفۆس لە سەرەتای سەدەی بیستەم چەندین کەسایەتی گەورەی ناو کۆمەڵگەی دیموکراسی نێونەتەوەیی ناسیوە، چەندین زمانی زانیوە، پیاوێکی کارای فێڵبازی و زۆرزانی بووە، پێش ئەوەی هاوکاری لینین بکات بۆ دەرکردنی رۆژنامەی (مەشخەڵ)، رۆژنامەیەکی ئیشتراکی دەرکردووە. لە رووسیا ئەشکەنجەدراوە و لە فەرەنساش دەرکراوە، لە ئینگلتراش بواری مانەوەی نەدراوە، بە پشتیوانی و یارمەتی ئیشتراکییە ئەڵمانییەکان لە میونشنی ئەڵمانیا ماوەتەوە.

کە شۆڕشی رووسی ساڵی ١٩٠٥ بەرپابووە، ئەو ئازادانە بۆچوونی خۆی دەربڕیوە، تا ترۆتسکی نازناوی مارکسی گەورەی پێبەخشیوە. لە سەرانسەری هەموو وڵاتان یەکێتییەکانی پیشەیی دامەزراندووە، ئاڵای سووری لە سەر بارجەی سەربازی (بوتنکین) هەڵکردووە، حزبە شۆڕشگێڕەکان و سەندیکاکان مانگرتنی سیاسییان راگەیاندووە، ئەوەش پێشهاتی یەکەم بووە لە مێژووی رووسیادا، پاش ئەو هەنگاوە یاخیبوونی چەکداریشی راگەیاندووە. بافۆس بۆ بەسەرهاتی ئەو رۆژانە و شێوەی رووداوەکان نووسیویەتی:

من و ترۆتسکی گوریسێك بووین یاری شۆڕشمان لەسەرکرا.

پاش ئەوەی دەستەڵاتداران لە زۆر بڕیار و بەرنامەیان پاشگەزبوونەوە و بڕیاری ریفۆرمی زۆریاندا، بزاڤە شۆڕشگێرییەکە لەناو بێشکەدا مرد، شۆڕشگێرەکانیش دیارە بەناچاری ئاوارەبوون و کەوتنە تاراوکە. سالانی ١٩٠٧ و ١٩٠٨ سالە زۆر تاریکەکانی ژیانی بارفۆس بووە، دووبارە گەڕاوەتەوە شاری میونشن، لە سیاسەت دوورکەوتیتەوە و دەستی داوەتەوە کاری تایبەتی خۆی، لە ماوەیەکی نزیکدا بووە بە خاوەن بازاڕێکی باشی پارە و بانك، ئەو رەوشەی تازەی بواری داوە سەردانی هوتێلە پلە بەرزەکان بکات و سواری ترێنە خێراکەی خۆرهەلات ببێت. هەموو لایەك لە نهێنی سەرمایەکەیان دەپرسی، زۆر تاوانبارکراوە کەوا ئەو سامانەی بە ساختە و فێل پەیداکردووە، هەتا هاوڕێیە شۆڕشگێرەکانیشی بە دزینی ئەو سامانەی بەردەستی تاوانباریان کردووە. بەڵام گوێی بەو قسانە نەداوە، بەردەوام سەرپەرشتی کار و بەرنامەکانی کردووە، هەموو ئیشتراکییە دیموکراسیخوازەکان لێی دوورکەوتوونەتەوە، تەنها ترۆتسکی نەبێت، ئەویش جاروبار دووردەکەوتەوە.

## شاراوە دەوڵەمەندەکە

لەو قۆناخەی ژیانیدا بارفۆس، تەنها بیری لە سامان و کاردکانی کردیتەوە، لە بەهاری ساڵی ١٩١٠ بیری لەوە کردەوە بچێتە ئەستەنبۆڵ، کە سواری ترێنە خێراکە بووە، بەردو ئەو شارە رۆیشتووە تەنها ١٣٠ هەزار مارکی ئەلمانی پێبووە.

بارفۆسی پیاوێکی کەڵەگەت و چوارشانەبووە، کێشی قوورسییەکەی ١٥٠ کیلۆ دەبوو، چەکمەیەکی ئەستووری لە پێ کردووە. لەو سەفەرەدا رووبەرووی ژنێکی فەستان سپی لەبەر و پێلاوە شیاوەکەی و قژ تەسریحەکراوێکی زێدە ناسك بوودە، وەك ژنە ئەجیبزادەکان دیاربووە. زۆری نەخایاندووە، پاش یەك چارەگە سەعات، ئەو کۆنە شۆڕشگێرە بە هاوشانی ئەو ژنە هاتە ناو چێشتخانە پلە بەرزەکەی ترێنەکە. ئەو ژنە خۆی بەناوی (کونتیسە بنفنوتو دلا بییتا) دەناساند، بەڵام لە راستیش قەحپەیەکی

ناوداری پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بوو، سوودیشی لەو ئاسانکارییانەی دەستی دەکەوت دەبینی. بەو پەیوەندییە بارفۆس وەك کەسێکی پیاوی کار سوودی وەرگرت، زۆری نەخایاند وەك سەرچاوەی زانیاری گرنگی سەفیری ئەلمانی هاتە پێشەوە. پاش ئەوەی نێوانی لەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگری خۆشکرد و چەکی ئەلمانی دەفرۆشت، بە ماوەی پێنج ساڵان سامانێکی زۆری پێکەوەنا. لە جانفی لە ساڵی ١٩١٥ سەفیری ئەلمانی نامەیەکی بارفۆسی گەیاندە بەرلین، پەیامەکەی ئەوەبوو، کەوا بەرژەوەندی حکوومەتی ئەلمانی و بلشفییەکان لە رووسیا هاوتەریبە، دیموکراسیخوازەکانی رووس ناتوانن رژێمەکە بگۆڕن و سەرکەوتنی ئەلمانیاش لە شەڕەکە بە هەڵگیرسانی شۆڕش لە رووسیا دەبێت.

پاش شەڕیش رووسیا مەترسییەکی گەورەیە لە سەر ئەلمانیا، تا لەو مەترسییەش دوورکەوینەوە وا باشە بۆ چەندین وڵاتی سەربەخۆ دابەشبکرێت. مەبەستی سەرەکی ئەویش شێواندنی هاوکارانی قەیسەربوو سەبارەت بە شۆڕشگێرانی رووس و لە خودی لینینیش، ئەوەش بۆ کات بەسەربردەبوو، تا ئەو زۆرترین سەرمایە بەدەست بهێنێت. لە کۆتایی ساڵەکە بارفۆس بووە راوێژکاری سەرکردایەتی ئەرکانی ئەلمانی، ئەویش سەرمایەکەی لە ساڵی ١٩١٥ گەیشتە یەك ملێون مارك. بارفۆس بواری خۆی دۆزییەوە و پەیمانگەیەکی بۆ توێژینەوەی هۆکار و دەرئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی دامەزراند، بەپێی بەڵگەی مێژوونووسی ئەمریکی داڤید شۆب لە مانگی مایۆی ساڵی ١٩١٥ زۆرجار لە زیورخ لینینی بینیووە.

## کۆمەکی لینین

ئەگەرچی بارفۆس زۆر مەبەستی نەبووە پەیوەندی خۆی بە لینین ئاشکرا بکات، حەزی بە ئاشکراکردنی ئەو پەیوەندییە نەبووە، بەڵام بەناچاری بۆ راستی دیدارەکانی دانی بەو دیمانەی لینین داوە. زۆر تێبینی و زانینی خۆی لەسەر ئەنجامەکانی کۆمەڵایەتی و شۆڕشگێری شەڕەکەی بۆ باسکردووە، هەورەها گێراویەتەوە کەوا لینین

رای وابوو، ئەگەر شەڕەکە زۆرتر درێژتر بێت، ئەوا شۆڕشەکەی ئەڵمانیا لەباردەبات، بۆیەش ڕەنگە شۆڕش تەنها لە رووسیا بەرپابێت، ئەوەش پاش سەرکەوتنی ئەڵمانیا دەبێت..

سەرچاوە دبلۆماسییەکانی هەنگاری دووپاتی ئەوەیان کردیتەوە، کەوا ئەو هەڤاڵبەندییە زۆر یارمەتی **چالاکییەکانی** بەلشفییەکانی داوە. ئەو سیستەمی لینین و بارفۆس هزریان بۆی **دارشتووە** بە شێواویی دیاربووە، مامەلە داراییەکانیان شاراوە بووە، چەندین **پێناویان هەبووە** بۆ داپۆشینی ئەو پەیوەندییەی بە بەرژەوەندی هەواڵگری ئەلمانی **دەیانبەستێتەوە، یان** ئەو کۆمەڵگایانەی تەنها ناویان هەبووە ... هتد . پاش گەڕانەوەی **سەرۆکی** بەلشفییەکان لە تاراوگە کۆمەك و یارمەتی نێوان بارفۆس و لینین **گەشەی کردووە، لە ئەپریلی** ساڵی ۱۹۱۷ بۆ ئەلمانەکان ترێنێکی تر مێژووی سەدەی **بیستەمی گۆڕی،** ئەویش گەڕانەوەی لینین بوو بۆ رووسیا، تا هێزەکەی رووسەکان لاواز **بکەن. لینین** لەو ڕەوشەدا نەفام نەبوو، بۆیە لە دانوستانەکانا لەگەڵ ئەلمانەکان زۆر **هوشیار** و بە پارێزبوو.

## فارگۆنەکەی شۆڕش

لەبەر بوونی پەیوەندی بە بارفۆسەوە، تا بە جاسووسی بۆ بەرژەوەندی ئەڵمانیا تاوانبار نەکرێت، لینین داوایکرد سیفەتی سیاسی و پارێزراوی بدرێتە ئەو ترێنەی بۆ هاتوچۆ بەکارهاتووە. ئەلمانیش ئەو سیفەتەیان قەبوول بووە، چونکە لە کرینی ئەو فارگۆنانەدا پارەی زۆریان سەرفکردووە، بەو ترێنە لە ئەپریلی ساڵی ۱۹۱۷ لینین و ژنەکەی و دۆستە بەرەگەز فەرەنسییەکەی نایناس نورماند و چەندین کەسایەتی بەلشفی ترەوە چوونە ناو خاکی رووسیا.

بارفۆس بەو سەفەرە زۆر دڵشادبوو، ئەگەر ئەو ترێنە نەبوایە ڕێڕەوی مێژووش نەدەگۆڕا و شۆڕشی بەلشەفیش هەڵنەدەگیرسا و کودەتاکەی ئوکتۆبەریش نەدەبوو، بەو پێشهاتە بوو رووسیاش لە شەڕەکە دەرچوو. شەڕەکە بواری نەدابوو بارفۆس بە ترێنە

خۆشەویستەکەی سەفەران بکات، تا لە نۆڤمبەری ساڵی ١٩١٨ لە کۆشکەکەی لە سویسرا مرد، لەو کۆشکەدا ئەو ئاهەنگی گەورەی بەبەردەوامی سازکردووە.

ئەگەرچی شۆڕشی رووسیاش هەڵگیرسابوو، بەڵام ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات و ترێنەکەی سیبیریا هەر لە پێشەوەبوون و بایەخی خۆیان هەبووە، بە چاودێری ٣٢٧ پاسەوان و بە ترێنەکەی سیبیریا قەیسەر و خێزانەکەی بەرەو ئەیکاترنبۆرگ رایانکردبوو. سەرەتا لیون ترۆتسکی ی دامەزرێنەری سوپای سوور و پارێزگاری میللەت کاری سیاسییان لەسەر ئاستی دەرەوە کردووە پاشان شەڕیان دەستپێکردووە. دەستی بە ترێنەکەدا گرتووە و کردبوویە موڵکی خۆی، کەسە نزیکەکانی خۆی لەسەر هێڵی ئاسنین داناوە و فەرمانی دابوو نووسینگەی تایبەتی خۆی و هۆڵی کۆبوونەوە لەسەر ئەو ترێنە دامەزرێنێت، لەویش پێشوازی لە مێوانەکانی کردووە. ترێنەکە لە چەندین فارگۆنی هاوشێوەی ترێنەکەی خۆرهەڵات بووە، لەناو ئەو فارگۆنانەدا هۆڵی فراوانی تێدابوو، ئەو شوێنە پێش شۆڕش تایبەت بووە بە وەزیری گەیاندنی قەیسەر.

ترێنەکەی ترۆتسکی ئەفسوناوی بووە، ئەوەی سواری بووە هەستی بە دیاردەی نامۆ و تازە کردووە، رێز و شکۆی لێوەشاوەتەوە، هەروەها هەست بە ترسیش کراوە. ترێنەکە بە دوو قاتیرەی گەورە راکێشراوە، تەقەمەنی زۆر ئەستوور و کەرەستەی زیاد و ئێستگەی رادیۆیی و یەکێکی تەلگراف و چاپەمەنی و گەرماو و وەرشەی چاککردنەوەی ئوتومبێل و گەراجی ئوتومبێلە بە رەشاشەکانی و تەنکی گەورەی بەنزینی تێدابووە، لەبیرمان نەچێت مولیدە و یەدەگی چەکیشی تێدابووە. ترێنە گەورەکانی تری رووسیاش ببوونە سەنتەری گشتی پارێزگاری میللەت، ئەو ترێنە لەسەر گیانبازەکانی لە ئەورووپا بەردەوام بوو.

## ترێنی جاسووسەکان

زۆرجار ماتا هاری لە نێوان ساڵانی ١٩١٠ و ١٩٣٠ بە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات سەفەری کردووە، ئەویش وەك فۆن بابانی بەرپرسی هەواڵگری ئەڵمانی لە تورکیا ئەوەی

بۆ پلەی وەزیر بەرزکردیتەوە. مارگریتا گیرترویدا تا ئێستا ناوی راستەقینەی ماتا هارییە، ئەوەی سەماکەر و عەمیلێکی دووسەرە بوو بۆ بەرژەوەندی ئەلمان و کەسایەتییەکی رەمزی بووە لەناو ترێنە ئەفسوناوییەکە.

ماتا هاری یەکەم ژنە سەماکەربووە بە رووتی سەمایکردووە، نمایشەکانی لە شارەکانی ئەورووپی دەنگ و سەدایەکی زۆری ناوەتەوە، بۆیە سکرتێری یەکەمی کاروباری فەرەنسی کۆمبون کەوتە داوی ئەو سەماکەرە رووتە، زۆریش پارە و دڵ و شەکیان لەبەر پێیەکانی داناوە، بەڵام ئەو ژنە تەنها عاشقی ئەفسەران بووە بە تایبەتی فرۆکەوانەکان. کە شەڕی یەکەمی جیهانی هەڵگیرساوە، ئەو سەماکەرە بە هۆی کۆلۆنیل هولندی گەڕاوەتەوە وڵاتەکەی، لەبەرئەوەی ئەو خەڵکی وڵاتێکی بێلایەن بوو لەو شەڕەدا، بۆیە بۆی هەبوو بە ترێنە خێراکە بێتەوە پاریس، لەو سەردانانەیدا هەواڵگری ئەلمانی لێوەی نزیکبوونەتەوە، تا جاسوسی لەسەر ئەفسەرانی فەرەنسی بکات، لەبەرئەوەی ژنێکی زیرەك بووە، بۆیە بە شێوە کلاسیکییەکانی خۆی بە ئاسانی رایکێشاونەتە سەر سەرینە نەرمەکەی خۆی و زانیاری زۆری لێ دزیبوون.

## نازدارەکەی ترێنەکە

لەسەردانێکی کورتی بۆ شاری مەدرید، دۆستێکی کۆنی دۆزیوەتەوەو پەیوەندییان گەرم بووە، ئەو دۆستە کۆنەی، پلەی ملحقی سەربازی ئەلمانی لە ئەسپانیا هەبووە، دۆستەکەی تا لە ناوی ببات و خۆی لەو جاسووسە رزگار بکات، نامەیەکی بە شفرەی بۆ بەرلین ناردووە، فەرەنسییەکان دەلیلە نهێنییەکەیان دۆزیوەتەوە، بە گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا کە داوای پارە کردووە، ئاشکرابوو، بەرژەوەندی قەڵاچۆکردنی جاسووسی دەستگیریانکردووە، کە گیراوە پێشنیاری کردووە بۆ ئەوانیش کار بکات، جاسووسێکی دووسەرە بێت، بەڵام ئەوەی بۆ نەچووە سەر.

لەو رۆژانەی رەوشی سیاسی فەرەنسا ئاڵۆز و شێواوبووە، دەستەڵاتدارانی فەرەنسی کەسیان نەدۆزیوەتەوە تا ببێتە جاسووسێکی راستەقینە، تەنها ژنە نازدارەکەی ترێنەکە

نەبێت، بۆیە لە ئوکتۆبەری ساڵی ۱۹۱۷ بە تومەتی جاسووسی تاوانبارکراوە، ئەو رووداوەش دیعایەکی گەورەی لە ناوەندەکانی سیڤیل و سەربازی خولقاندووە.

## ناوکی جاسووسییەتی نێونەتەوەیی

لەناو ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات چەندین تۆڕی جاسووسییەتی دامەزراوە، لەوانە زۆریان سۆڤیەتی بوون، ئەو تۆڕە جاسووسییەی ستالین دایمەزراند بێ وێنەبووە لە جیهان، بەهۆی ئەو تۆڕە پێشەوای کرملین زانیاری نهێنی راستەوخۆی لە وەزیری یەکەمی بەریتانی تشرشل یان لە سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکییەوە وەرگرتووە.

ناوی چەندین جاسووسی گەورەی تایبەت بە کرملینی سەر ئەو ترێنەش، لە دیمانەیەکی دوورودرێژی سەرۆکی پێشووی جیهازی ئاسایشی دەوڵەتی سۆڤیەتی کی بی جی وەرگرتووە، ئەوانەی کی جی بی مەسروفی هاتوچۆ زۆری بۆ دەدان، وەك فیلبی و ئایتنگتۆن و مارکدار و سۆرج ... ئەوەی زانراوە ئەو ترێنە ناوکی یەکەمین شانەی تۆڕی جاسووسی نێونەتەوەیی لەسەر دامەزراوە و کاریانکردووە. لە بیستەکانەوە دیمتری بیسرولیتوف یەکێکە لە زیرەکترین یاساناسان، وەك سەرچاوەی باڵای شوفرەی نهێنی دبلۆماسی بەناوی هانس یان بە ناوی ئەندری، بەناو و کەسایەتی چەندین کەسانی شازادەوە سەفەری زۆری کردووە.

## راوەستانی ترێنەکە

لە ئەلمانیا هیتلر دەستەڵاتی وڵاتی بە توندی گرتۆتە دەست، لە سۆڤیەتیش ستالین وەك کەسی بەهێزی یەکەم لە کرملین و جەمسەری گەورەی شیوعییەت هاتووتە پێشەوە، پاش ئەو رووداوانە لە ساڵی ۱۹۳۱ ترێنەکە وەستاوە. ستالین هەر لە ساڵی ۱۹۲۸ دوە گرنگی و ئەرکی هەموو دەزگاکانی حکوومی و حیزبی و یاسادانان و رێکخراوەیی و کۆمەڵە کۆمەڵایەتییەکانی خستە بن دەستەڵاتی خۆیەوە، هەموو ئەو دەزگایانەی ئەو مەبەستی بوون بەرنامە و چالاکییان نەما.

لە شەوی ١٠ی فبرایردا ترێنەکە گەیشتە ئودیسە، لە پەنجەرەکەوە چەندین شوێنم هاتە پێش چاوان هەمووم دەناسییەوە، بەو شارە ئاشنابووم، حەوت ساڵی تێدا خوێندکاربووم، فارگۆنەکەمان یەکسەر بە قاتیرەکەوە وەنوسابوو، لەو شەوە تاریکەشدا بەفرێکی زۆر دەباری. بە گەیشتنی ترێنەکە بۆ هەر ئیستگەیەکی چەندین دەستەی تایبەتی بەرژەوەندی پاراستنی ئاسایش لە فارگۆنەکان کۆدەبوونەوە.

## دوورخستەوەی ترۆتسکی

ترۆتسکی دەستبەتاڵ لە مۆسکۆ دەرچووبوو، بۆیە دەبوایە بەناچاری لە تورکیا بڕێ پارە بۆ خۆی و دارودەستە هاورێیەکەی پەیدا بکات. سەرەتا کۆمەڵە وتارێکی دژ بە سیاسەتی ستالین نووسی، پاش چەند هەفتەیەك نوایەکی شیاوی بۆ ژیان و ئیسراحەتی خۆی و خێزانەکەی پەیداکرد. ڤیلایەکەی لەناو دوورگەیەکی دووردەستی پارێزراوبوو، هەموو پێداویستییەکانی ئەمنیەتی بۆ ئاسان بوو، دوورگەکە ناوی برانکیبوبوو، گەورەترین دوورگەی ئەرخبیلی ناو دەریای مەڕمەڕە بوو. چەند میلێك لە ئەستەنبۆڵەوە دووربوو. ترۆتسکی چەند ساڵ بوو بەرهەڵستی رژێمی سۆڤیەتی کردبوو، ویستی لەو شوێنەوە بەردەوام بێت. ستالین تۆڕێکی فراوانی لە جاسووس و پیاوکوژان بە رووی ئەو رێکخستبوو. ترۆتسکیش بە چەندین کەسایەتی فزوولی و یاوەرو جاسووسیش دەوری گیرابوو، ئاپوورەکەی دەورەی زۆربوون، بۆیە نەدەکرا باش و خراپ لەیەکتری جیابکرێتەوە، زۆربوون ئەوانەی لە دەرگایان دەدا، بۆیە پاراستنی رەوشەکە بەو دوو پۆلیسە تورکەش نەدەکرا کە حکومەت بۆ پاراستنی ڤیلایەکەی داینابوون.

شەوانە تا درەنگ بە دیار کارو بەرنامەکانی دەمایەوە، لەبەر زۆری بۆی تەواو نەدەبوون بۆیە بەیانی زوو حەوتی بەیانی لە خەو رادەبوو و خەریکی بەرێکردنی کارەکانی دەبوو، بەردەوام وتاری دەنووسی و رۆژنامەو بڵاوکراوەکانی تەماشا دەکردو کتێبی سیاسیی دەخوێندەوە و دیمانەی بەردەوامیش هەبوو. ترۆتسکی لەو شوێنەوە چاودێری رەوشی رووسیای کردووە، هەموو دەنگوباسەکانی بە هۆی چەندین تۆڕەوە بۆ

هاتووە، ئاگاداری برسییەتی هاوولاتییان و نارەزایی بەردەوامیان بووە و دەیزانی خۆپیشاندان و رووداوەکان لەو ولاتا بێ ژمارن. ترۆتسکی کاتەکانی پشودانی لەسەر دەریا بەرێکردووە، ئەو ئاگاداری ئەوە نەبوو ستالین تۆڕێکی جاسووسی لە چوار دەورەی چاندووە، چەندین راپۆرتیش ئاماژەیان بەوە دابوو، کەوا ستالین بەرنامەی کوشتن و لەناوبردنی هەیە. کە زانی بەرنامەی کوشتنی هەیە نامەیەکی لە ٤ ی ینایری سالّی ١٩٣٢ بۆ مەکتەبی سیاسی لە مۆسکۆ نارد، لە نامەکەیدا نووسیبووی، ستالین ئەوەی لە کۆڵ خۆی کردەوە و هەڵەی زۆری کرد لە ولات بەرەو ئاوارەیی دەریکرد.

بەرامبەر بوونی پلانێکی کرملین بۆ کوشتنی، دەستەیەك بە سەرپەرشتی گەورە کارمەند و شارەزای ئەو کارانە (لیونید ئایتانگۆن) کاریان دەکرد، لیونید رۆژێك لە ئەمریکا و جارێك لە چین و زۆریش لە ولاتانی ئەورووپا دەسووڕایەوە، ترێنە خێراکەی خۆرهەلاتیشی بەکارهێناوە، سەرۆکی پۆلیسی سیاسی کرملین سەرسام بوو بەو کەسە، لیونید لە رۆژانی شەڕی ناوخۆی ئەسپانیا لە سالّی ١٩٣٦ بەناوی هاوڕێ بابلۆ و بەناوی ژەنرال کۆتۆف بینرابوو، همنگوای لە وەسفکردنی شەڕە ناوخۆییەکە زۆرجار ناوی هێناوە و ئاماژەی پێکردووە، لەبەرامبەر ئەو چالاکی و کۆششانەدا ترۆتسکی باش هەڵسوکەوتی نەکردووە.

لە فارگۆنەکەی خۆیدا لیونید دیداری بەردەوامی بە رووسە سپییەکان و کەسە ناودارەکان و بەکرێگیراوانی کرملین و سیاسەتمدارانی ئەورووپی هەبووە. بە دەنگی بەرزەوە دەقەکانی ئەویان دەخوێندەوە و باسی ئەدەب و توێژینەوەی دەروونی و سیاسییان کردووە، بەو شارەزاییەی خۆییەوە بوویتە یەکێك لە گەورە شارەزایانی تۆڕەکانی ژنانەی ستالین، ئەوەش پاش ئەوەی لە سالّی ١٩٣٩ ژنێکی ئەسپانی جوانی نورستراقی بە رەگەز کۆبی هێنایە پێشەوە و بە ناوەندەکەی ناساند.

ماریا کاریداد دال ریو ئایرناندز لە خێزانێکی ناوسراو بە خەباتگێر بۆ رزگاریکردنی ولاتانی ئەمریکای لاتینی لە ئەمریکاییەکان و لە مکسیکییەکان بووە، باپیری یەکەمی نائیبی حاکمی کۆبا و باپیریشی سەفیربووە لە رووسیا. ئەگەرچی ژنێکی

کەڵەگەت بوو، بەڵام چاوە رەشەکان و بسکە بچووکەکەی سەر نیوچەوانی و رۆیشتنە جوانەکەی ئەو ژنەی زۆر نازدارکردبوو. بەپێی قسەی سەرۆکی پێشووی وەکالەتی هەواڵگری سۆڤیەتی کی جی بی ئەو ژنە لەگەڵ لیونید بە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات دووجار سەردانی کردوون. ترێنەکە پەیوەندییەکەی کردۆتە برادەرایەتی.

## جاسووسە ژن و مێردەکان

ئەزموونەکەی ماریا کاریداد بۆ پێکهێنانی تۆڕی جاسووسی لە ژن و مێردان بۆ کرملین زۆر باش بوو، چونکە ئەو هاوسەرانە بەرهەمیان باشترە لە جاسووسی تاکەکەس، بۆیە لەسەر ئەو ترێنە ئەفسوناوییە دەستەی تر لەو کارە کەوتنە مەیدان. ژنە جاسوسێکی تری رۆمانی بەناوی ئیلیزابت زاروبیناش شەیدای سەفەربوو، ئامادەبوو بۆ بەرژەوەندی شۆڕشەکەی هەموو شتێك بکات، ئامادەبی قوربانیشی هەبوو، کە زانی پیاوە دۆستەکەی لە رێگای نێوان گەڕانەوە و هاتوچۆکانی تورکیاوە، دووسەرە جاسووسی دەکات، دوودڵ نەبوو زوو ستالینی ئاگادارکردیتەوە ئەویش کوشتی.

پاش ئەوەی خۆی وەك جاسووس بۆ کرملین ساخکردەوە، ئیلیزابیت شووی بە ئەفسەرێکی هەواڵگری سۆڤیەتی کردووە. ئەو ژن و مێردە بە کەمی دەهاتنەوە مۆسکۆ، ئەوان لەناو ترێنەکە بە دوو کەسی شۆخ و پۆشتە و لەبەرکردنی جلوبەرگی جوان و رازاوە ناسرابوون، بۆیەش ئەو کەسانە گومانیان لەسەر نەبوو. ئەوان لە رۆژانی شەڕی دووەمی جیهانی دیداری ژنە جاسووسێکی تریان بووە، ئەویش ژنە ئەکتەر ئولگا تشیکۆفای برادەری زۆر نزیکی ئەیڤا براون بوو. ئەو جاسووسە هەموو وردەکارییەکانی ناو بەرلینی بە ستالین راگەیاندووە، زوو زووش سەردانی کردووە. ئولگا پەیوەندی نهێنی بە کرملین هەبووە، سەرۆکەکەی بیریا سووربوو لەسەر ئەوەی خودی خۆی سەرپەرشتی بکات، پاش شەڕی دووەمی جیهانی کەوتە ناو تۆڕی بەرژەوەندی قەڵاچۆکردنی جاسووسی سۆڤیەتی، بۆیە بیریا خۆی کەوتە نێوانیان، ئەو ژنە ئەکتەرەی رزگارکردووە، ئەوەی لە ماوەیەی چەند ساڵێکا سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری بوو بۆ ئەو.

# دیاری ژنە کلۆرییەکە

کاریداد بۆ ئایتانگۆن نموونەی ژنێکی زۆر تایبەتی بوو، بۆیە دوودڵ نەبوو رامۆنی کوڕی بکاتە دیاری ستالین تا ترۆتسکی پێ بکوژێت. پاش ئەوەی پێووت کەوا کرملین لە پیاوکوژێکی شارەزا و زانا دەگەڕێت بۆ لەناوبردنی ترۆتسکی، ئایتگۆن بێ بیرکردنەوە یەکسەر داواکەی ستالینی بە ماریا راگەیاند، ئەوەی بیست ساڵی تەواو لە رۆژانی شەڕی ناوخۆی ئەسپانی کەسێکی ترۆتسکی بووە. بەرنامەکە بە باشی چووە پێشەوە بڕیاردا رامۆنی ناسراو بە مورنارد بگاتە سکرتێرە مێینەکەی ترۆتسکی، سیلڤیا ئەنجلف تا کەوتە داوی، پاش ئەوەی خۆی وەك پارەدارێکی مێباز نیشاندا.

ئایتانگۆن و ماریا رامۆنیان گەیاندە مەکسیك، ترۆتسکی ئەو ماوەیە لەو وڵاتە ئاوارە دەژیا، زۆرینەی کەسە نزیکەکان دەیانزانی رامۆن رۆژنامەنووس و پیاوێکی پارەداری نزیك لە سوپای سوور نییە، بەڵکو دۆستی سکرتێرە ژنەکەی ترۆتسکی یە. پاسەوانە تایبەتییەکانی ترۆتسکی رۆژی سێشەممەی ٢٠ ی ئوگستی ئوتومبێلەکەی رامۆنی جۆری بویکیان لە سەعات پێنج و بیست دەقە بینی لە پێش ڤیلایەکەی کوایوکان وەستابوو، بۆ بەیانی شوێنەکی گۆڕابوو، دوو ئوتومبێل چاوڕێیان دەکرد، یەکێکیان ماریا کاریداد دەیهاژووت و ئەوی تریش ئایتانگۆن دەیهاژووت.

ترۆتسکی و ژنەکەی لە تەنیشت قەفەسێکی گچکە وەستابوون، بەیانییان لەوە راهاتبوون خواردنیان دەدایە کەرویشکەکانیان، رامون بە ڕووێکی ناخۆش و ماندووەوە بەرەو ڕوویان چوو، بۆیە ترۆتسکی وایزانی نەخۆشە و ئامۆژگاری کرد نیسراحەت بکات. دامەزرێنەی سوپای سوور نەیویستووە زۆر بە قسەکانی رامون بڕوا بکات بۆیە خۆشی سەردانی خانووەکەی کردووە.

ترۆتسکی لەسەر کەروێتەکە پاڵی داوەتەوە و رامۆنیش لەسەر سەری وەستاوە، تا زەنگ بۆ پاسەوانەکانی لێنەدات، زۆر نزیك بوویتەوە، تا بە باشی دەمانچەکەی دەربهێنێت، بە هێمنی پاڵتۆکەی داکەندووەو لەسەر مێزەکەشی داناوە.

پاشان رامون گێراویەتییەوە، چاوەکانم قوچاند و یەك گوللـەم لەسـەری دا، هـاواری لێ هەڵسا، هەرگیز ئەو هاوارەم لـەبیر ناچـێتەوە. بـۆ بـەیانی لـە نەخۆشـخانە گیـانی لەدەستدا. یەکسەر فەرمانی گرتنی رامون دەرچوو، پاش گرتنەکەی وتی:

من بۆیە ترۆتسکیم کوشتووە لەبەر ئەوەی رازی نەبووە، دۆستەکەم بهێنم.

**ئەگەرچی** کرملین باشترین پارێزەری بۆ گرتبوو، بەڵام بکوژەکە بیست ساڵ گیرا. ئـەو رووداوە **پاشـان** کرایـە فیلمێکـی سـینەمایی بـەناوی (کوشـتنی ترۆتـسکی)، رۆڵـی **فیلمەکەش** لەلایەن ئـالان دیلۆنـەوە بینـراوە. رۆژی کوشـتنەکە ئایتـانگۆن بـە رێگـای پاریسەوە بەرەو مۆسکۆ بەرێکەوت و ماریا کاریدادیش بۆ بوخارست بۆی دەرچوو، رۆژە خۆشەکانی لەگەڵ جاسووسەکەی کرملینیشی لە ناو ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتیشی هـەر لەبیربوو.

ستالین نازناوی پاڵەوانی یەکێتی سۆڤیەتی لە جیاتی خۆی پێشکەشی دایکی کـرد، لە ماوەی مانەوەشی لە مۆســکۆ تووشـی کێـشەی ئـالۆزیش هـات. ئایتـانگۆن پـاش ئازادکردنەکەشی لە ساڵی ١٩٧٣ ویستی شتەکانی لەبیربچێتەوەو رووە خۆشـەکانیـشی هەر مابوو. زۆرجار وتوویەتی:

**تا لە یەکێتی سۆڤیەت** بە ئارامی بژیت وا باشە بـە جوولەکـەیی لـەدایك نـەبیت، **ژەنەراڵێك بیت** لە بەرژەوەندی جاسووسی و ترێنەکەی خۆرهەڵاتیش بەکارنەهێنیت.

**پاش** رووخانی **یەکێتی سۆڤیەت** وەکیلە سەربازەکـان وتیـان ئـەو شـتانەی بـەرووی کرانەوە و پێ تاوانبارکراوە هەموویان هەڵبەستراوبوون، ئەوەش پاش ئەوە هـات کـە لـە ساڵی ١٩٨١ لەسەر سەرینی نەخۆشی کۆچی دوایی کردبوو.

# خۆشەویستی خۆرهەڵات

ڕۆماننووسی ئینگلیزی ناودار (ئەجاتا کریستی) مێژووی ترێنە ئەفسوناوییەکەی ئەمر ڕاگرتووە. لە نزیکەوە بەشداری ڕووداوەکانی کردووە و زۆر تۆڕەکانی جاسووسی دۆزیوەتەوە. لە ساڵی ١٩٣٠ لەسەر ئەو ترێنە بووە و بەرەو میسر ڕۆیشتووە، لەو کاروانەدا گۆڕانێك لە ژیانی ڕوویداوە. لەناو ترێنەکەدا بە جوانی چالاکی و هەڵسوکەوتەکانی دەبینی، ئەگەرچی ئەو جاسووسی هیچ لایەنێك نەبوو، بەڵام وەك جاسووسێکی شارەزا دەجولایەوە. ئەجاتا ژیانی منداڵی لە ئینگلترا زۆر سەرفرازبووە. ئەگەرچی پێگەیەکی ئەدەبی باڵای هەبووە، بەڵام لە جیابوونەوەی یەکەم پرۆسەی هاوسەرایەتی دووچاری نسکۆیەکی زۆر هاتووە. کریستی زۆر شەیدای خۆرهەڵات بووە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا لەگەڵ دایکی وڵاتی میسری دۆزیوەتەوە، وا پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتۆتە چل ساڵ بە هاوکاری ماکس مالۆینی تەمەن بیست و شەش بەهار دووبارە بۆ دۆزینەوەی کلگۆی (توت غنج ئامۆن) دەچێتەوە میسر. مالۆین نەیدەزانی ئەو ژنە وەك نووسەرێك ناسراوە و نووسینەکانی ڕەواجی زۆرە، بەڵام ئەو دەیزانی ئەو ژنە زۆر زیرەکە، پاش شەش مانگ بووە هاوسەری، لەو ڕۆژەوە ژیانێکی نوێیان دەستپێکردووە.

ئەگەر ئەو ترێنە بە ترێنی جاسووسان ناوبانگی دەرکردووە و ئەوان زۆریان بەکارهێناوە، بێجگە لەوانەش ئەو ترێنە لەلایەن ئەرکۆلۆجییەکانیشەوە بەکارهاتووە، هەر بەو ترێنە دوو ئەرکۆلۆجی تر بۆ میسر دەچوون، لەناو ترێنەکەدا هاوڕێیەتی یەکتریان کردووە، دیارە ئەو ژن و مێردەش باب و باپیرانی (ئەنا) بوون. چوار کەسەکە بەیەکەوە خۆشیان ڕادەبوارد، بە وێنەکێشان و نووسین و خوێندنەوە و توێژینەوە و وێنەی فۆتۆگرافی خەریك دەبوون، پاش ئەو گەشتە لەیەك دابڕان، تا لە ڕۆژانی شەڕەکە دیداری یەکتریان کردەوە. مێردەکەی کریستی لە خۆرهەڵات کاریکردووە، لە میسر و عیراق و سووریا ماوەتەوە، ئەویش لەو کاروانانەدا هاوشانی بووە و بە وێنەگرتن و چاککرنەوەی کەرەستە قووڕە شکاوەکان و شتە کۆنەکان و نووسینی ڕۆمانەکانی سەرقاڵ بووە. ماکس و کریستی بەو ترێنە سەفەری زۆریان کردووە، تا گەیشتوونەتە جەرگەی بیابانیش، لەو ناوچانە ماونەتەوە و خانووشیان بۆ خۆیان چێکردووە،

لەو ماوەیەدا ماکس شاهێدی نووسینی سێ ڕۆمانی ژنەکەی بووە، وەك (مردنەکەی سەر نیل)، (تاوانێك لەناو ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتدا)، (مردنێك لە وڵاتی میزیوپۆتامیادا).
خەونەکەی کریستی بە هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی کۆتایی هاتووەو گەڕاوەتەوە لەندەن و مێردەکەی بە ئەفسەری لە سوپای بەریتانی گەیشتۆتە تەرابلوس، ئەو لە ناوچەکە باش شارەزابوو، زمانی عەرەبیشی زۆر بە باشی زانیوە. مێردەکەی کریستی وەك بەڕێوەبەری شوێنەواری لە عیراق دامەزراوە و بەیەکەوە بەرەو عیراق بەرێکەوتوون، لە عیراقیش خانوویێکیان دروستکردووە.

## نووسینەکانی کریستی

کریستی گەشتەکانی لەو ترێنەدا نووسیوەتەوە. لە ئیستگەی فیکتۆریای دەروازەی کراوە بەرووی جیهان، بەرێکەوتووین. ئەو وتوویەتی:
هەموو ئیستگەکانی ئەو ترێنەم خۆشویست، ترێنەکەم خۆشویست ئەوەی بەناو ئەوروپایدا گێڕام، بۆنی زۆر خۆش بوو، بۆنی لەگەڵ بۆنی ترێنەکانی زەیتی جیاوازبوو، بە دووکەڵەکەی ئەوان دەبووراینەوە، سەفەر بەو ترێنە، پێی دەوتی، دەبی بڕۆین .. دەبی بڕۆین! زوو دەبیتە هاوڕێی، لەو ترێنەدا هەست بە حاڵەتی دەروونی خۆش دەکەیت، چونکە هەموو لایەك زەوقی ڕۆیشتنت لا دروست دەکات .. دەڕۆین دەڕۆین...
سواری فارگۆنەکەی نووستن بووین، وا ئێمەش دەڕۆین، ترێنەکە بەرێکەوت، پاش چل و پێنج چرکە هەستم بە ماندووبوون کرد، بەڵام هێدی هێدی کامەرانی و خۆشی باڵی بەسەر ڕەوشەکەدا کێشا، کە لە ئیستگەی فیکتۆریا دوورکەوتینەوە هەستمان بە گەشتێکی خۆش و سەرفرازکرد.
لەو فارگۆنانەی نووستن ئارام بووین، ئەو فارکۆنانە وەك ئەوانەی پێشتر نەبوون، وەك فارگۆنەکانی پلە یەکەمەکانیش نەبوو. لەبەر جانتاکانی ماکس زۆرتر فارگۆنەکانی نووستنمان بەردەکەوت، هەر لەبەر جانتاکانی ئەو بوو، چونکە هیچ فارکۆنی تر بەرکەی ئەو بارە زۆرەیان نەدەگرت، ئەو کتێبە نازدارەکانی زۆر خۆشدەویست رازی نەبوو بچێتە ناو فارگۆنی ترەوە.

به تێپەربوونی سەردەمێکی زۆر ترێنەی سمبلۆنی ئەورووپی خێرا پەیدابوو، بەو ترێنە زۆر لەناو ئەورووپا سوڕاینەوە، لە سەردانەکەمان بۆ کەناری شین لە فەڕەنسا ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتمان دۆزییەوە، لەکار کەوتبوو و فڕێ درابوو، ئەو ترێنەی خەونمان پێوە دەدیت، سەفەری پێ بکەین و سواری بین، لەو ڕۆژانەوە برادەرمان بوو، کە سواری دەبووم هەستم بە شادومانی زۆر کردووە و ئەو ترێنە ترێنی خۆشەویستمان بوو.

ڕووداوە ڕاستەقینەکان سەرەتای ڕۆمانەکانی ئاجاتا کریستی بوون، ڕۆمانێکی لەسەر کوشتنی ڕێبوارێکی ئەمریکی بێکەس و تەنیا نووسی، کە لە ساڵی ١٩٢٩ لەسەر ئەو ترێنە کوژرا، کە زریانی بەفرێکی زۆر ساردی پلەی گەرمایی ٢٥ پلە ژێر سفرەوە لە دووری ١٣٠ کم لە ئەستەنبوڵ ڕووبەرووی بۆوە و مرد.

لە ئەرشیفی ڕۆمانەکانی کریستی دا زۆر سەرچاوەی ڕاستی و نهێنییەکانی بەسەرهاتەکان دەدۆزرێتەوە، لە ڕۆمانێکی دا باسی هێرشەکەی ٢١ ی سێپتەمبەری ساڵی ١٩٣١ لە هەنگاریا کراوە، کە تێدا ٢٠ کەس کوژران و ١١٠ کەسیش بریندار بوون، لەوانە جۆزیفین باکر بوو.

## شەڕەکە

لەبەرئەوەی ترێنەکە لە ڕێگادا بە نێوان فەڕەنسا و ئینگلترا بۆ ڤینیسیا و یوگۆسلافیا، بە ئەڵمانیا و ئەمسادا دانەدەچوو، بۆیە لە سییەکاندا ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات ببووە یەکێك لە کابوسەکانی ئودولف هیتلر. لە مارسی ساڵی ١٩٣٨ ئەڵمانیای نازی پاش ئەوەی ئەمسا و ئەڵمانیای کۆنترۆڵکرد، هێڵەکانی ئاسنی بە ڕایخ بەستەوە و گرێبەستەکانی جرمانی ئەمساوی تایبەت لە کۆمەڵەی دەولی کردە فارگۆنی نووستن، بەوەش کۆنترۆڵی تەواوی هێڵەکانی ئاسنی کرد، بە تایبەتی پاش تەنگژەکەی شاخەکانی سودات و ڕووخانی چیکۆسلۆفاکیا. کە سلۆفاکیا سەربەخۆیی ڕاگەیاند و نازییەکان ناوچەکانی البوام مورافی کۆنترۆڵکرد و لە ناوچەکە چەندین کوڕانی هەرێمایەتی ڕوویدا، لە نێوان ساڵانی ١٩٣٩ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٠ شەڕی دووەمی جیهانی هەڵگیرسا، ئەو شەڕە گەشتەکانی ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتی ڕاگرت، بەڵام ترێنی سمبلۆنی خۆرهەڵاتی خێرا گەیشتە ئەستەنبوڵ و

ئەسینا، ئەو ترێنە چەندین فارگۆنی لە بەرلینەوە رادەکێشا و لە بەلگرادەوە دەکەوتەوە رێگاکەی.

لە فارگۆنێکی تایبەتی ئەو ترێنەدا بەیانی سەرکەوتنی ١١ ی سپتمبەری ساڵی ١٩١٨ لەلایەن فۆخەوە ئیمزاکرا، لەبەرئەوەی هیتلر حەزی بەو جۆرە هیمایانەکردووە، بۆیە رێکەوتنی ئاگربەسەکەی رۆتوندی لەناو هەمان فارگۆنەکە ئیمزاکردبوو. پاش داگیرکردنی فەرەنسا و ئاگربەسەی یونیوی ساڵی ١٩٤٠، کۆمەڵە تایبەتییەکانی فارگۆنی نووستنەکان لە ئیتالیا و سربیا و کرواتیا و هەنگاریا و بلگاریا و رۆمانیا لەلایەن ئەلمانەکانەوە چاودێری و پشکنینی لەسەرکراوە. شای رۆمانی کارۆلی دووەم بە ترێنە خێراکە گیانی خۆی و خێزانەکەی و دۆستەکەی بە جلی گۆڕاوی چێشتلێنەرەوە رزگارکردووە، کە لە ٦ ی سپتمبەری ساڵی ١٩٤٠ دا لەناو ترێنەکە دوورکەوتەوە.

## ترێنەکە وەك ئەورووپا هەڵوەشایەوە

ترێنی سمپلۆنی خۆرهەلاتی خێرا، لە شازدەی مارسی ساڵی ١٩٤٠ لەکار راگیرا، فارگۆنەکانی بۆ فارگۆنی نووسین هەڵوەشێندرایەوە، ئەویش وەك ئەورووپا بۆ چەندین وڵات هەڵوەشێندرا، ئەلمانەکان تا دەستەلات و هێزیان لەناو ئەورووپا دیاربکەن، چەند ترێنێکی خۆرهەلاتی خێرایان خستە کار، ئەگەرچی ترێنەکان نایاب و باش بوون، بەڵام رێبوارەکان لە ترسی ئەو شەڕانەی لەسەر هێلەکان لەلایەن بەرهەڵستکارانەوە روویان دەدا، کەمتر بەکاریان دەهێنا و ئارەزوومەندانی نەمان، فارگۆنەکان کرانە فارگۆنی نووستن و فارگۆنی سەرکردایەتی و ترێنی تەندروستی.

ئەوانەی ئەو ترێنانەیانیش بەکاردەهێنا لەبەر چاوی سەرکردەکانی نازی ئەوانەبوون، وەك ماریشالی رۆمانی ئوتونسکۆ و ئەمیرالی هەنگاری هورسی، هەروەها ئەمیرال کناریسی بەرپرسی بەرژەوەندییە نهێنییەکانی نازییەت و فرانز بۆن ئەوەی چالاکییەکانی جاسووسکاری ئەلمانی ناو ئەنقەری بەرێوەدەبرد، هێلی رۆیشتنی ترێنەکانیش لە بەرلینەوە بەناو ڤیینا بەرەو بالکان بووە.

# نوای گیانبازان

سەرەڕای بوونی ئەو کێشانە، ترێنەکان بۆ کەسانی گیانباز و راونراوەکان ببووە نوایەکی باش، چەندین پاشای دوورخراوە و دۆقی دەرکراو و کۆنتی رەسەن و بارۆنی گۆمانلێکراو و ژنان لە هەموو ولاتانی جیهان سەفەریان پێکردووە، کەم کەمیش وەك رێزپەرێش چەند دبلۆماتێکی ولاتانی بێلایەنیش سواری دەبوون و بەکاریان هێناوە. دایك و باوکی ئەنا دووجار ئەو ترێنەیان بەکارهێناوە، لە رۆژانی شەڕەکە ئەوان سەرقالی کاری پشکنینی شوێنەوارەکانی میسربوون، لەوێ دوو کەسی نزیکی پاشایان دۆزیوەتەوە و ئەوانیش شازادە شافیکیار و حیسی العرنی مێردی بوون، ئەو چوار کەسە ئەو ماوەیە بەردەوام بەیەکەوەبوون و لەیەکتری جیانەدەبوونەوە.

لە فبرایری ساڵی ١٩٤١ دا ئەورووپا بەتەواوی بە ئاگری ئەو شەڕە دژوارە دەسووتا، لەو کاتانەدا ئینگلیز و ئەلمانەکان ململانییان بوو، تا دەست بەسەر ولاتی میسردا دابگرن. لەو رۆژە سەختانەدا هوتێلەکەی ئەرکۆلۆجییەکان شوێنی ئارام بوو بۆ گێڕانی شەوانە ئاهەنگی خۆشی، ئەوەش پاش ئەوەی برادەرەکەیان رەزامەندی لە مەلیك فاروق وەرگرت بۆ دانانی مێزی زۆر یاری و گەمەی شەوانە.

دبلۆماتە ئینگلیزەکە تاکە کەس بوو دەیزانی ئەو دەستە ئەرکۆلۆجییانە بۆچی هاتوون و خەریکی چین، بەرنامەی کاریان لە قاهیرە چییە؟؟! لە راستیدا ئەو پیاوە بۆ دەزگاکانی نهێنی ئینگلیزی لەسەر داوای برادەرێکی ئینگلیزی ئەو وەزیفەی وەرگرتبوو، کە شەڕەکە هەڵگیرسا ئینگلیز داوایان لەو ئەرکۆلۆجییانەکرد قاهیرە چۆڵ بکەن و بچنە پراگ و پەیوەندی بە راوول و نولنبرگی دبلۆماسی بکەن، ئەویش ئەوەی یەکێکە لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی ولاتانی ئەسکندنافی بوو.

یەکسەر کە هاوپەیمانان لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٤٤ لە نورماندی دابەزین، دبلۆماسی ـ بێلایەنی ـ بە رەگەزنامە سویدییەکە، سەفیری ئەمریکی لە نزیك ستۆکهۆلم بینی، سەفیرەکە داوای لێکرد بگاتە هەنگاریا، یان لە گیتۆکانی بودابیست ئەو جوولەکانەی بە گاز دەخنکێنرێن لە مردن رزگار بکات. تاکە پەیوەندی گەیاندنیش لەو رێگایە ترێنەکەی نێوان بەرلین و بودابیستی بەکارهێنا بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە.

## فریادرەس

سەفیرەکەی ئەمریکی وەعدی بە دبلۆماتە سویدییەکە دابوو پارەی ئەو سەفەرەی بۆ تەرخان بکات، تا بتوانێت بە باشی بە ئەنجامدانی کارەکەی هەڵبستێت. هەروەها ئەو ژن و مێردەی لە پراگن ئەوانیش یارمەتی و ئاسانکاری بۆ دەکەن، ئەوەشی پێراگەیاند کەوا سەفیری سویدی لە بودابیست ئەوە نازانێت، ئێمە کۆمەك و پشتیوانی تۆمانکردووە بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی سەر شانت، کەسی سێیەمیش ئاگادارە سکرتێری سەفیرەکە و بەس. کە پەناشمان بۆ تۆ هێناوە لەبەرئەوەی تۆ کەسێکی بێلایەنیت.

راوول والنبرگ یەکسەر بە رەزامەندی وەڵامی پێشنیار و راسپاردەکەی داوەتەوە. پاش هەشت رۆژ سنووری وڵاتی دانیمارکی بڕیوە و پارەی وڵاتی ئەڵمانی و هەنگاریی لە گیرفان بووە، بەڵام لەناو جانتاکەی پارەی باشتر و لیستی ناوی بەرهەڵستکارانی نازییەکان و لە هەنگارییەکان و ناوی دەستەڵاتدارانی هوسرییش وەرگرتووە، ئەوەی بە نهێنی پەیوەندیشی بە سۆڤیەتەکانەوە هەبوو. سێ رۆژ لە بەرلین مایەوە، سەفارەت لە ترێنە خێراکەی ئەڵمانی فارگۆنی تایبەتی بۆ حیجزکردبوو، وادەی سەفەرەکەشی بەو ترێنە مانگی یولیو بوو، ترێنەکە تەنها سێ فارگۆنی شکاوی مابوو. لەو رۆژەوە راوول بووە عەمیلێکی ئەمریکی پاش ئەوەی هەواڵگری سویدی (ئەس سی) چاندبووی، ئەگەرچی بەپێی هەڵکەوتە ستراتیژییەکەی بایەخی سیاسی زۆری هەبوو، بەڵام ئەو تۆڕە لە هەنگاریا و چیکۆسلۆفاکیا پەیوەندی و ناسراوی کەم بووە. پەیوەندی ئەڵمانی هەنگاری نەبوو، بەڵام دەستەڵاتدارانی سوید بۆ مەرجەکانی هیتلر بەناچاری ئامادەییان نیشاندابوو، بەتایبەتی لە بوارەکانی ئابووری و پیشەسازی هاوکاری بکەن.

## ترێنی ئەڵمانی

والنبرگ بەپێی بەرنامەی کارەکەی کەوتە شوێنێکی زۆر نائاسایی بۆ کۆکردنەوەی وەزعیەتی سیاسی و سەربازی لە هەنگاریا، لە شوێنەکەی ئەو هێزەکانی ئەڵمانی و سۆڤیەتی بەرامبەری یەکتری بوون.

باپیری (ئەنا)ش سەرلەنوێ لە پراگ گەیشتەوە خۆشەویستەکەی، ئەگەرچی هاوکاری والنبرگیشیان دەکرد و لە ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتیش دووربوون، لەو شارەدا بەیەکەوە لەناو کۆڵانە کۆنەکانا بە سەرفرازیشەوە پیاسەیان دەکرد. بە کۆشکە نازدارەکانی ناو کۆڵانە چاکنەکراوەکان و بە گەرەکەکانا و بە پردە مەزنەکان و باڵەخانە سەیرەکانی ئەو شارە زەوقیان وەرگرتبوو.

ئوتومبێلە نووکتیژەکانی ناو شەقامی شارەکە، لەژێر کۆنترۆڵی داگیرکەرانی نازییەت خۆرهەڵات و خۆرئاوای بەیەکەوە بەستابۆوە. لەو شوقەیەی ژن و مێردەکە بەکرێیان گرتبوو رۆژانە چاوەڕوانی پەیامە نهێنییەکانیان دەکرد، وا راهاتبوون، ئەو شەوەش (زینە) خەریکی لە دەستکردنی بازنە فنتازیاکانی بوو، باپیری ئەنا بڕیاری دا بە ترێنە ئەلمانییەکە بۆ دواجار بۆ دیتنی راوول والنبرگ سەفەر بکات.

ئەو ژن و مێردە لە ساڵی ١٩٤٥ پاش رزگارکردنی شارەکە لەناکاو بزربوون، هەموو لایەك رایان وابوو لە تەقینەوەکانی ئەو رۆژانەی شاری پراگ مردوون، بەڵام والنبرگ لە سەردانێکی بۆ مەڵبەندی سەرکردایەتی سوپای سووری سۆڤیەتی لە بۆدابیست، یەکسەر بە فەرمانی بولگارنینی جێگری وەزیری بەرگری سۆڤیەتی گیراو رەوانەی زیندانەکانی مۆسکۆ کرا. والنبرگ رازی نەبوو هیچ جۆرە هاوکارییەکی دەزگاکانی هەواڵگری و نهێنی سۆڤیەتی بکات، ماوەیەکی زۆر دەنگ و هەواڵی نەما تا سوید لە یولیوی ساڵی ١٩٤٧ داوای ئازادکردنی کرد، لە وەڵامی ئەو داوایەی سوید گرومیکۆی وەزیری کاروباری دەرەوەی کرملین لە فبرایری ساڵی ١٩٥٧ وتبووی:

ئەو کەسە بە نەخۆشی دڵ لە زیندانەکەی مۆسکۆ مردووە.

بە تێپەربوونی ماوەیەکی زۆر جاسوسی سۆڤیەتی سودوبلاتۆف ئاشکرای کردبوو کەوا والنبرگ گوللەبارانکراوە و لاشەکەشی لەلایەن پاسەوانەکانی سووتێندراوە. لە ساڵی ١٩٨١ کۆنگریسی ئەمریکی نازناوی هاووڵاتی شەرەفی ولایەتە یەکگرتووەکانیان پێدا.

## بودابست

ئەو چیرۆکە یەکێکە لەو چیرۆکە سامناکانەی ترێنـەکان دەوریـان تێدا گێـراوە. پـاش شەڕەکە ململانێ کەوتە نێوان فرۆکە و ترێنە تازەکان. بۆل موراند لە شێستەکـانی سـەدەی رابردوو نووسیویەتی:

**ئەگەر ملیونێرەکانی ئەورووپی بەناگابینیتەوە هەموو بۆیان دەردەکـەوێـت ئـەو ترێنـە خێرایەی خۆرهەلآت ترێنێکی باش و نایاب نەبوو، ئەو ترێنـەی ترێنـی مردنـی خێرابـووە، ئەگەرچی مەکینەکەی وەك دلێکی بەژانی لێهاتبوو، لـە دەسـت گرژبـوونی شـادەمارەکانی دەمینالآند!**

ماك ئورلان پێناسە و گوزارشتی ترێنەکەی بەو شێوە کردووە، زۆرمان لەبیرە، زۆر هەیە لەسەر ئەو ترێنە بنووسرێتەوە، لەناو ئەو ترێنەدا رێبواران لـە تـەنیاییـەکانـدا، یـان لـەناو فارگۆنە نازدار بە کەرەستە و دیمەنە جوانەکانی تایبەتیدا، شەوانـە یـان رۆژەکـان چـەنـدین دیمەنی قەشەنگیان هاتووتە پێش، لە پەنجەرەکانیەوە روویان بە ناسـۆی گەشـەوە شـادبووە، بەهۆی ئەو گەشتانە جیهانی نوێ بۆ رێبواران دۆزراوەتەوە، کە سـەفارەکەی دەنگی هـاتوود، نیستگەی تازەو شوێنی نوێ و یادگاری تۆمارکردووە، ئەو یادگارانە بە تێپەربـوونی زەمـەن ماون و لە ناو هزرا چەسپیوون، ئەوانە هەموویان وای کردووە مـرۆڤ خـەون بـە دوارۆژێکـی گەش و پرشنگدار ببینێت.

ئەگەر رەوشێکی تایبەتی کای و ئەنای سواری فارگۆنە شینە ئەفـسوناوییـەکـانی ترێنـە خێراکەی خۆرهەلآت کردبێت، ئەوە بڕوا نەدەکرا لە بەرەبەیانییەکی سـەدەی بیـست و یـەك دوو هاوولآتی نیویورکی ئەمریکا سـەرنشینی ئەو ترێنە بن، چونکە زۆربـەی ئـەوانـەی ئـەو ترێنەیان بەکارهێناوە بەشدارانی شارە بچووکەکانی ئەلمانیان، یان ئەوانەی سـەرنشینی پاپۆرە دبلۆماسییەکانی سەر بوسفۆرن.

ترێنەکە لە سەعات شەش و نیو بەرەو هەنگاریا بەرێکەوت، بەرەو خۆرهەلآت رۆیشت، کای بە هیوای دووەم دیداری یاکلۆفلف بوو. کای و ئەنا دەیـانزانی خانووەکـەی بـەگزادەکان (نیستیرازی) لە سـەدەکـانی هـەژدەم و نـۆزدەم روانگـەی نیگـای هونەرمەنـدانی بـەرزی ئەورووپابووە، بەتایبەتی هایدن.

هەردووکیان شەیدای هەردوو مۆسقیاژەنی ناوداری جیهانی فرانز لیسنرت و بلا بارتۆك بوون. ئەوان زیرەك بوون لە وەرگرتن و شارەزایی زمان و دیالیتیك، زوو هەستیان کرد، ئەو زمانە تازەیەی لە بودابیست ناخاوتنی پێدەکرێت، رەگی فنلندی هەنگاری لە پشت شاخەکانی نورالەوە وەرگرتووە.

## ولاَتی ترێنە خێراکە

ئەنا لە ژوورەکەی خۆیان لە هوتێل پاڵ کەوتبوو، بە مێردەکەی وتبوو:

ئەو ترێنە ئەوروپایی بووەو ولاَتی هەنگاریاش ولاَتی سروشتی ئەو بووە، ئەوەی دلَخۆشکەرە پێگە و جێگەی خۆی دۆزیوەتەوە و نەجولاوە. هوتێلی جیلارت ئەگەرچی تەمەن سەد ساڵێك دەبوو، بەلاَم هێشتا گەرماوەکانی باش بوون، لەگەڵ گۆڕان و رووداوە درامیەکانی ئەو ولاَتە هەر بەپێوە راوەستاوە. ئەو هوتێلە لە گوندێکی ناوداربوو، لە ساڵی ١١٧٨ نەخۆشخانەیەکی تێدابوو، لەناو نەخۆشخانەکەدا گەرماوێکی هەبووە، دەستەلاَتدارانی عوسمانی لە ساڵی ١٤٣٣هوە، ناویان لە گەرماوەکە ناوە گەرماوی کەنیزەکانیان و تایبەتیش بووە بە بەگزادەکانی خۆیان، لە ماوەی ١٥٠ ساڵەی مانەومیان لە هەنگاریا، میللەت بۆی نەبووە بێتە ناو گەرماوەکان.

لیوبودی دووەمی لە ساڵی ١٦٨٧ گەرماوەکەی کردیتە مولکی نەخۆشخانەکە و لەو رۆژەوە بوویتەوە مولکی شارەکە. گەرماوەیەکەیان کردە دوو بەش بەشی ژنان و بەشی پیاوان، ئەو دابەشبوونە لە ساڵی ١٨٢٧ تا ئیمڕۆش ماوە، لەو شوێنەدا گەرماوی تەندروستی و چارەسەری و ئەو هوتێلە لە ساڵی ١٩١٨ دروستکراوە. ئێوارەکە ژن و مێردەکە بە پیاسە لە هوتێلەکە دەرچوون، بە پیادەیی بەسەر پردە بە زنجیرەکە رۆیشتن، ئەو شەوە هەستیان بەو مەزنی رووباری دانوب کرد، لە باست سەردانی گەورەترین کەنیسەی ئەورووپایان بینی. شکۆداری جولەکەی هەنگاریان پێش شەڕەکەیان هەست پێکرد، هەروەها چوونە سەردانی خانووی ترسەکە، ئەوەی تێدا شیوعییەکان ئازار و ئەشکەنجەی زۆریان تێدا چشتبوو.

## دۆزینەوەی نهێنییەکی گەورە

پاش نانی ئێوارە ئـەنـا ویـستی مەبەسـتی نهێنـی دیمانەکـەی ئـەلکـسندر یـاکفلۆف بشارێتەوە، کە زانی کەسی ژمارە دوو گورباتشۆف لە هوتێلی جـیلارت سـەعـات یـازدەی بەیانی ئارەزووی دیتنی دەکات، زۆری نەما دڵی لە خۆشیا بێتە دەرەوە.

بە منیان وت، تۆ لە زانیاری لەسەر باپیرت دەگەڕیت، ئەو زانیارییـەی لـە ئـەرشـێفی رووسی پارێزراوە، بەراستی ئەو پاڵەوانێکی شەرکەربوو، بێگومان ئەو لە پراگ کوژراوە، لەو دەمانـە کـوژراوە کـە هـاورێ ئـەو گەنجینـە کـەسـانەبووە کـە لـەو رۆژانـەدا لـە مـردن رزگاریانکردوون. ئایا دەزانی پیاوانی ستالین چەند ساڵ وێلی دۆزینەوەی ئەو گەنجینەیە بوون. لە گیرفانی چاکێتەکەی پارچە کاغەزێکی دەرهێناو دایە دەست ئەنا و پێیوتبوو:

بێگومان ئەوەی من کردوومە مەسەلەیەکی یاسایی نییە، بەڵام ئەوەم بۆ یادی پیاوێکی شایستەکردووە، یادگارێکم لە ئەرشیفەکەی والنـبرگ لـە ئـەرشـیفی فیـدرالی رووسـییەوە هێناوە، وێنەیەکی دڕاوە، وێنەکە لە ناو گۆڕستانێك گیراوە، نازانم بۆ لەو گۆڕستانە گـیراوە، بەداخەوە پشتەوەی وێنەکە ناخوێندرێتەوە، باش دیار نییە ........ وا بزانم تۆ پارچـەکـەی تری وێنەکەت لەلایە، چونکە من بەشەکەی ترم لە دیداری یەکـەمـان لـە مۆسـکۆ دابـووە مێردەکەت. لەناکاو لە خۆشیان و بۆ زۆرتر سوپاسکردنی ئەو پیرەمێردە، ئەنـا خـۆی فرێـدا باوەشی. کە دوورکەوتەوە، لە ژوورەکەی خۆی هەردوو پارچەکەی بەیـەکـتری وەنوسـاندەوە، ئەوەی دوو پیتی (ت) و (تا) تێدا نووسراوە، بەهەردووکیان توانی بخوێنێتـەوە، پـەرسـتگای ......

ئەو دڵنیابوو وێنەکە لە پراگ وەرگیرابوو، باپیرانی ئەنا لـەوێ ژیـاون و لـەوێ مـردوون، بۆیە پێویستی بەوە بوو ئەو گۆڕستانە بدۆزێتەوە کە رەچەڵەکەی ئـەوەی تێدایـە، ئـەوان لـە دەرزییەك لەناو پووشدا دەگەڕان. سەرەڕای ئەو ئەرکە نادیار و قوورسە سواربوون، ئـەوجـارە بەرەو پراگ بەرێکەوتن.

## سیحری پراگ

ئەنا و کای کە گەیشتنە پراگی پایتەختی چیك، لەناو لاپەڕەکانی مێژوو بزربوون، چەند سەدەیە البوام و مۆرافیا و سلۆفاکیا لە ڕەوشێکی زۆر تایبەتی هاوبەش و لەیەکدابڕاویش بووینە. شای البوام شارلی چوارەم لە ساڵی ١٣٤٦ ەوە حاکمی سەر کورسی بووە، زۆر حەزی بە هونەر و نامەنووسین کردووە، هانی هونەرمەندانی داوە سەردانی پراگ بکەن، شەیدایانی هونەرمەندانی بۆ ئەو ناوچەیە بەردەوام بووە. لەو سەردەمەدا دەستنووسی نەخشەکانی (جین تروبو) جیهانی سەرسام کردبوو، دروستکەری پردی شارلز، (بیتر بارلر) ئەندازیارییەکەی ناوی دەرکردبوو، ناوبانگی مۆسیقاژەن (سمیتانا) و (دفوراك) و هەردوو نووسەرەکەی (کافکا) و (کاباك) و نیگارکێشەکەی (موشا) هەموویان مەشخەڵی شۆڕشێکی ڕۆشنبیری گەشاوەبوون، وێنەی دەگمەن و شایستەی بەرزی دڵی ئەورووپا بوون.

(میلان کاندیرا) هیمای ئەو بزاڤە هونەرییە بوو. ئەگەرچی ئەو هەڵگری ئالای فەڕەنسیش بوو، بەڵام هەر نەیتوانی بەرهەمەکانی لە خۆرئاوا چاپ بکات، کای و ئەنا لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا یەکێکی بە ڕەگەز چیکیان بەناوی میلۆس فۆرمان دۆزییەوە، ئەو هاوڕێیانی زۆر لە بەهرەمەندانی پراگ بووە، هونەرمەندی وا هەبووە بۆ یەك شەو لە پراگ ماوەتەوە، شاعیران زۆر هاتوون تا خەون و هیواکانیان لەو شارە ڤالا بکەن، هاتوون تا لێرە بنووسن، نیگارکێشان هاتوون تا لەسەر کەناری ڕووباری ڤالتافا وێنە بکێشن، موزار و برلیور باشترین بەرهەمەکانیان لە پراگ نووسیوە، قونسلی فەڕەنسی لە ساڵی ١٩٠٦ دیداری فرانز کافکای کردووە.

هاسبۆرگ بۆ ماوەی چوار سەدە حوکمی چیکی کردووە، تا ساڵی ١٩١٨ چیکۆسلۆفاکیا سەربەخۆیی نەبووە، سنوورەکەی لە ساڵی ١٩٢٠ کێشراوە. لە سەردەمی نێوان هەردوو شەڕە گەورەکەی جیهان دایك و باوکی (ئەنا) و دایك و باوکی (کای) لە ژیاندا مابوون، ئەگەرچی ناکۆکی و نائارامیش لە نێوام چیك و سلۆفاك هەبووە، ئەو دەمە چیکۆسلۆفاکیا وڵاتێکی پێشکەتووی خۆشگوزەران بووە.

هیتل رلـه کۆبوونـەوەی میونـشنی رۆژانـی ۲۹ و ۳۰ ی سـپتمبەری ۱۹۳۸ دا، بەئامادەبوونی شامبرلین و دلابی و مۆسۆلینی، سێ ملیۆن هاوولاتی و سی هەزار کم خاکی ئەو ولاتەی دابڕی. بە هەمان شێوە هەر لەو کۆبوونەوەیەدا داوای چەند هەرێمی هەنگاریا و پۆلونیای کردبوو، لە ماوەی یەك مانگدا ئەو ولاتە پێنج ملیۆن هاوولاتی و چارەگی پێداویستییەکانی بەرهەمی پیشەسازی و سێ بەشی خاکەکەی لەدەستدا.

کـە سـلۆفاکیا سـەربـەخۆیی راگەیانـدبوو، سـوپای نـازی تـەواوی ولاتـەکـەی داگیرکردبوو، دەستەلات و پاریزگـاری خـستبووە سـەر البـوام مـۆزافی، بـە چـەنـد هەفتەیەك ولاتێکی وەك چیکۆسلۆفاکیای لەسەر نەخشە رەشکردەوە. ئـەو ولاتـە لـە ماوەی سەدەی بیستەم رووداوی زۆری بەسـەرداهاتووە، لە سالّی ۱۹٤۸ شـیوعییەکان ولاتەکەیان کۆنترۆلکرد و ٤٠ هەزار دادگایان لە شاری پراگ دانا، ئـەو رەشـبگیری و دادگایانە بە کۆششی ئارتۆر لندن و فیلمی

(دانپێدانان) زۆرتـر ناسـراو و ئاشـکراتربوو. کـە لـە سـالّی ۱۹٦۸ مەشـخەڵـی سەرهەلّدانەکەی بەهاری پراگ و شۆڕشی دژ بە شیوعیەتی لێکەوتـەوە، بـە دەبابـە و ٦٠٠ هەزار سەربازی پەیمانی وارشۆ دامرکێندرایەوە. باشتربوو چیکەیەکان چاوەڕوانی شۆڕشەکەی نووسەری نـەیاری دەسـتەلات (فـاکلاف هاڤـل) یـان کردبوایـە، تـا بـە سەربەستی و ئازادی بگەن، ئەو چیرۆکەش گۆڕانی زۆری لە نەخشەی سیاسی ناوچەکە نایەوە.

## جوانترین شاری جیهان

کۆماری چیك لە مایۆی سالّی ۲۰۰٤ بووە ئەنـدامی یـەکێتـی ئـەورووپـی، کـە جوانی و رووناکی پراگی لە ئامێزە. پراگ هاوشانی شـارەکانی پـاریس و ڤینیـسیا و سانتپترسبۆرگە لە جوانیدا. کای و ئەنا لە هوتێلی ئەورووپا دابـەزین، هوتێلەکـە لـە بالّەخانەیەکی ئازدارە و شێوەیەکی هونـەری نایـابی پێوەیـە، دەکـەوێتـە گۆرەپـانی فونسیسلاس، هاوشانی گـەورە دامـەزراوەکانی ئـەورووپییـە. سـەرەتـای سـەدەکـە

هوتێلەکە پێشوازی لە بۆنە دیار و گەورەکان کردووە، کاری بەرنامەشی لەبەر ڕۆشنایی ئەو دروشمەیە بووە کە دەڵێت:

ئەگەر هەموو داواکانی میوانەکان جێبەجێکرد، میوانەکەت دووبارە دێتەوە.

ئەو هوتێلە تا ئەو سەعاتەش شێوە کۆنەکەی خۆی لەناو شارە نوێیەکە پاراستووە. بروتۆن ئەو شارەی بە پایتەختی ئەورووپا شوبهاندووە، بۆیە کای و ئەنا زۆر تامیان لە جوانی ئەو شارە وەرگرتبوو، هیوایان وابوو بگەنە مەبەست و بەدوای ئەو ڕاستییەدا ویل بوون. سێ نەتەوە لەو شارەدا دەژیت، چیك و ئەلمان و جوولەکە، لە هەموو نیگایەکی ئەو شارە بوونی شکۆیی بیناسازی ئەو شارەیان هاتووتە پێش، ئەوەی لە سەدەی چوارەمەوە دروستکراوە.

## شارە کۆنەکە

دوو میوانە گەنجەکە سەرەتا لەو شارەدا چوونە ناو بازارە کۆنەکەی، شێوەی سەرەکی باوی باڵەخانەکانی ئەو بازارە هونەری ڕۆمانی پێوە دیارە، لە چەندین نیگاشەوە شێوەی بەربەریشی پێوەیە، باڵەخانەکان نایابن، ئەندازیاری فەرەنسی و ئیتالی و ئەلمانی مۆرکی خۆیان چەسپاندووە بە بیناکان. لەسەر بەرزاییەکەوە تاوەری زۆری وەك تاوەری (سانت جاك)یان بینی، کە دەکەوێتە لای کەنیسەی سانت نیکۆلاس، تاوەری هوتێلی شار و تاوەری فەلەکی و زۆرن نزیکەی سەد تاوەر دیارن.

لە سەدەی حەڤدەم لە نێوان کۆشکی پاشاکانی البوام و گەورە ئیمپراتۆرەکانی هابسبۆرگ جوانترین باخچەی بارۆکی دروستکراوە، کە ڕژێمی شیوعییەکان لە ساڵی ١٩٥٠ نۆژەنیانکردەوە. لە شۆڕشە مەخلییەکەی ساڵی ١٩٨٩ ئەو باخچەیە کرا بە دڕکستانێکی دژوار. ئەو شوێنە وەك هەموو ئەو شوێنانە نەبوون کە ئەو دوو میوانە لە گەشتە دووروودرێژەکەیان بە ترێنەکەی خۆرهەڵات بینیبوان. لە هەوارزەوە بەرەو خوارەوە بۆی شووربوونەوە، لە ساڵۆنە کراوەکەدا دیمەنی زێدە نایابیان بینی. لە تەنیشت حەوزەکانەوە بە ناو ماڵە شووشەیەکان و پەیکەرەکان ڕەتبوون، دیمەنی

کۆشکی ئەمیرەکانی بەرامبەر باخچەی گەورەکەی فۆرستنبرگەوە بوو، لە تەنیشت سەفارەتی پۆلونیایەوە رۆیشتن. لەوێ ئەنا نووسینەکانی نووسەر شاتوبریاندی بەبیرهاتەوەی ئەوەی زۆر جوانی لەسەر شاری پراگی نووسیبوو، پاش ئەوەی دووجار لە ساڵی ١٨٣٣ سەردانی شارەکەی کردبوو، لە تاراوگەکەیەوە لە شا شارلی دەیەم نزیك بوو. نووسەرەکەش سەردانی ئەو شوێنانەی کردبوو، شەقامە هێمنەکان و بەرزاییەکان و کۆشکە شکۆدارەکەی پاشاکانی البوام و رۆژانە مێژووییەکان و رووخانی ئیمپراتۆرییەتییەکەی و وێنە مێژووییە نازادرەکانی لە مێشکیدا مابوون.

دیارە نووسەرکەش ئەو کات وەك ئەنا کاتی زۆری بەدەستەوەنە بوو، تا نهێنییەکانی جوانی پراگ و فرە کەلتوورەکەی ببینێت، یەك رۆژ بەشی ئەوە ناکات هەموو وردەکارییەکان و کەلتووره زۆرەکان و رەگی مێژووییان بدۆزێتەوە. بە سەردانیان بۆ سەعاتە فەلەکییە مێژووییەکە کۆتاییان بە سەردانەکەیان هێنابوو، ئەو سەعاتە یەکێکە لە شتە بەناوەکانی ئەو شارە، ئەوەی لە سەدەی پازدەهەمینەوە دروستکراوە. پێش ئەوەی بۆ ژوورەکەیان سەرکەون، نانی نیوەرۆیان خوارد، لە گۆشەیەکی جوانی ئەو هوتێلە دانیشتن، لە گۆشەیەکی چێشتخانەکە پیانۆیەك دانرابوو، گۆشەکەی تریشیان کەمانچەیەك هەڵواسرابوو، بەو دیمەنە سۆزیان بۆ شاری ڤینیسیای سیحراویی گەڕایەوە. ئەو ناوبانگە باش و جوانەی ئەو شارەش دەگەرێتەوە سەدەی پازدەهەم، سەردەمی ئیمپراتۆر شارلی چوارەم، ئەوەی بیری لە دروستکردنی پراگ بە نەخشەیەکی هاوچەرخانە و ئاراستەی شەقام و دانانی یەکەی مێژوویی کردبۆوە.

## شاری رووناکییەکان و کافکا

ئەو شارە رووناکە بە ژیان و جولەیە وەك چۆن (ریکلە) وتوویەتی:

ئەو شارە هەرگیز لەبیرناکرێت.

قسەیەکی ناوداریش لەسەر پراگ هەیە، پراگ ئەو دایکە بچووکەی چرنۆکەکانی دیارە، وازت لێناهێنێت.

بە هەمان شێوەش پێشتر فرانز کافکاش پێناسەی پراگی کردووە.

پەیوەندی ئەو دوو گەنجەش بە ترێنەکەی خۆرهەڵات و شاری پراگ قووڵـە، نـەك تەنها لەبەر ئەوەی ئەوانە ئەریت و هەڵسوکەوتەکانی ئەورووپای کۆنیان هـەڵگرتووە و بەس..

## بەبێ کافکاش پراگ ئەمر دەمینێتەوە؟؟

لە ٣ ی یولیوی ١٨٨٣ لە خێزانێکی ناوێتەی چەند رەگەزی کۆمەڵایەتی و زمـان لە البومی کۆن لەدایکبووە. باوکی پرۆڵیتاریایەکی چیکی بووە، لە گەرەکێکی کۆنی پراگ کە کۆنترین گیتۆیە لەدایکبووە، دایکی ژنێکی برژوا و رۆشنبیری گوزمران باشی ئەلمانی بووە، کە بواری ژیانی باشی بەو خێزانە داوە، سەرەتـا لـەناو خـانووی ژمـارە سێی شەقامی کالیتنای تەنیشت کەنیسەی (نـوتردام دو تیـنس) ژیـاون، پاشـان بـۆ خانووێکی خوارەوەی کۆگایەکی خەڵووز گواستیتیانەوە، نهۆمی یەکەمـی خانووەکـە تایبەت بووە بە دامەزراوێکی مۆزەخەکان.

ئەو شوێنە زۆر کافکای نارەحەتکردووە. ئـەو شـوێنەش وەك خـۆی وتوویـەتـی، شوێنی ئیلهام زۆر نووسینی باش و سەرکەوتووی ئەوبووە.

ئێمە گۆشەی تاریکمان هەبوو، شەقـامی نهێنـی دەیگەیانـدین، پـەنجـەرەی بـە گومان و گۆرەپانی نارێك و پەنای شاراوەمان هەبوو.

ئەو لەسەردەمی هەرزەکارییدا گەنجێکی سـەیر و نامۆبوو، هاورێیـەکـانی خۆشـیان نەویستووە، نووسینەکانی ئەو دەمانەی فەوتاندووە.

لە نووسـینگەی پارێزەرێکدا سـاڵێك مەشقی کردووە، لەو ساڵەدا ئاشنا و هاورێی زۆری پەیداکردووە، تا ساڵی ١٩٢٢ لە ئامۆژگەی تامینات کاریکردووە.

ئەنا و کای لە ژوورەکەی خۆیـان بـوون، بەرنامـەی گەشـتی بـەیانییان دادەنـا، بـەیانی سـەردانـی کافکـا یـان فۆسـت یـان رۆدولفـی دووەم یـان پاشـایە شـێت و سـەرلێشێواوەکە بکەن؟؟

هەردووکیان بە مترۆ بۆ گەڕان لە ماڵە ئەفسوناوییەکەی (فۆست) بەڕێکەوتن، بە ترامواى پردی لیبفتیان بڕی، ئەنا لووتی بە جامەکە وەنابوو، چاوی لە خانووە بڵاوەکانی لەسەر کەناری رووباری فلتاڤا بڕیبوو. لەپێش ئەو شانۆیە دابەزین، کە مۆزارت (دۆن جیوفانی) تیدا ئامادەکربوو، ئەو شانۆیەی مۆسیقاژەنەکانی چیك (دنوراك و سمیتانا)یان تێدا بەرهەمهێنا. کای و ئەنا بەسەر بەرزاییەکەی لوتکەی پراگ کەوتن، بە ئاسمانە هەورینەکە و شێواویی هەوردکانی دیمەنێکی زۆر سیحراوی دیاربوو.

## شاری شکۆداری

لە ساڵی ١٥٨٣ پاش ئەوەی رۆدلفی دووەم دەستەڵاتی وەرگرت، ئەو شارە بووە مەنزلگەی شاهەکانی البوام و هەنگاریان و ئەجیبزادەکانی ئەمسا و ئمپراتۆرییەکانی رۆمانی پیرۆز. رۆدلف بایەخی زۆری بە کۆکردنەوە و هێنانی هونەرمەن داندەوە، چەندین تابلۆی نازداری هێناوەتە شارەکە، وێنەکانی فلامونی سەردەمی رینسانسی ئیتالی لەو شارە داناوە.

ئەو رۆژانە سەرژمێری ئەو شارە ٦٠ هەزار کەس بووە، کۆمەڵگەیەکی فرە ناوێتەبوون، لەوان ئەوانەدا رێژەی بێگانەش زۆربووە. لەبەر ئەو ژمارەی زۆردی بێگانە، ئیمپراتۆر بڕیاری دابوو ئەڵمانەکان و ئیتالییەکان کەنیسەی تایبەت بە خۆیان بۆ مەراسیمی ئاینییان بنیات بنێن. ئیتالییەکان شێوەی تایبەتی هونەرسازی خۆیان بەکارهێنا و ئەڵمانییەکانیش شێوەی فینولیان لە بینادا پەیرەوکرد. پرسیارش ئەوەیە ئایا رۆدلفی دووەم دەبێتە زۆرداری پراگ؟

رۆدولف ئەوەی جیان لافولە، لە ١٨ ی یولیوی ساڵی ١٥٥٢ لە خێزانێکی پرۆتستانتی و کاسۆلیك لەدایکبووە، لە تەمەنی ١١ ساڵیدا لە کۆتایی ساڵی ١٥٦٣ ناردراوەتەوە مەدرید بۆ لای مامی فیلیپی دووەم، لەو ساڵانەدا توندی دادگای ئەسپانی بینیووە، ئەو حەوت ساڵانە بە چالاکی و شرۆڤەکردن و یادکردنەوە

ئایینییەکان ئەسپانییەکی زۆر باشی لێ دەرچووە. شەرمنی و هەبوونی بارانۆیایی لە کەسایەتی ئەو هەستی تەنیایی و ترس لە تەنیایی لا دروستکردووە، ئەوانە فاکتەر بووینە لە خەملاندنی کەسایەتی ئەو، ئەگەرچی ئەو لە کاتی گەنجەتیدا کەسێکی لیبوردە و نەرم بووە.

تەمەنی خۆی لەناو هونەرمەندان و نیگارکێشان و تابلۆی هونەری بەرز و دروستکەرانی سەعات و خوێندنەوەی شیعر و کۆکردنەوەی دیوانە بەرزەکانی شاعیرە ناودارەکان بەسەربردووە، تا وای لێهات فێری چەند زمانێکیش بووە. رۆدولف وەك ئیڤانی زۆرداری قەیسەری رووسیا، لە دوورەوە و لە پەناکانەوە حوکمی کردووە، بەردەوام لەناو کۆلانەکانی کۆشکەیەوە دەسوورایەوە و چەندین سیبەر و تارمایی راویان ناوە، عەبایەکی ئەسپانی قەدیفەی رەشی بە شەرشەفی زێرینەوە دەهاتودەچوو. تەنها فەلەکناس و دروستکەرانی ئاوێنەی سیحراویی بۆیان هەبوو، لە پاشا بچنە ژوورەوە، جاروباریش زەوقی دەکرایەود لە باخچەکەی کۆشکەکەیەوە بۆ دیتنی پەیکەر و ماڵە پلاستیکییەکان و نافوورەکان و باڵندەکان و بە تایبەتی شێرە ماڵیکراوە ئەفریقییەکەی دەسوورایەوە، بە مردنی بە قسەی یەکێك لە ئەنگۆرییەکان سەرەتای کۆتایی ئەویش بوو. ئەگەرچی ئەو رۆژانە هەستی بە بێزارییەکی سەیردەکرد، بەلام زۆریش شەیدای دەستەلاتیش بوو، ئامادەبوو بۆ نیشاندانی هێز و زۆرداربیەکانی هەموو شتێك لە پێش چاوی دوژمنەکانی بکات. لە رۆژی ٢٦ ی سپتمبەری ساڵی ١٦٠٠ کە هەستی بە خیانەتی یەکێك لە یاریدەرەکانی کردبوو، بە بریندارى تا مردنی لەو زیندانە بەندی کردبوو، لە ماوەی مانەوە حوکمەکەی چەندین کارمەندی نزیك و دڵسۆز و زانای کاروباری دەوڵەتی بە گۆمانی ترس و گۆمانکردن دوورخستبۆوە. لە کۆتایی لە ناو دەستەیەکی نەیاری خۆی مایەوە، رەوشی ئیمپراتۆرییەکەشی لاواز و پارچە پارچە ببوو، ئەمیرەکانی هەر کەسە بۆ خۆی راکێش راکێشی بوو، تورکەکانیش هێرشی بەردەوامیان هەبووە، تا شەری ١٥ ساڵەی نێوان موسڵمان و کاسۆلیکی لە نێوان ساڵانی ١٥٩٢ تا ١٦٠٦ لێکەوتەوە.

رۆدولف وای هات بە تەنها و لاچەپ ژیاوە، کومان و ترسی لەسەربووە، دەرچوونیشی شەوانەبووە، قسەی لەگەڵ کەس نەکردووە، لە ژیانیدا پێنەکەنیشی نەمابوو. روحی وەك جلوبەرگەکەی رەش ببوو، تووشی شێتبوونی وەراسی ببوو؟؟ چی بەسەرهات، لە ئەسپانیا ئەو رەوشتەی وەرگرتبوو، یان تورکەکان روویان لێنا و تووش بوو، دێوەزمەی کاسۆلیکی گرتبوو، هەر دەترسا و لە هەموو شتەکان لە فێل و ...؟؟ رۆدولف لە کۆتایی زۆرتر تووشی شێواندنی هۆش بوو، بڕوای بە کەس نەما، تا رۆژێك فالگرەوەیەك مەزندەی کۆتایی دەستەڵاتەکەی بە دەستی قەشەکان پێراگەیاند، بۆیە پاپای دوورخستەوە، لە بۆنە ئایینییەکان بەشدارنەدەبوو، تووشی هیستریایەکی راستی ببوو، تا قەدەر بە شێوەیەکی نەدیار تووشی خۆکوشتنی کرد و بە نهێنی ژیانی تەواوبوو.

## ماتەمینی پراگ

پراگ پاش مردنەکەی رۆدولفی دووەم ماتەمینی پێوە دیاربوو، ئەویش وەك شاری سانتپترسبۆرگ ماوەی یەك سەدە ماتەمینی گێرابوو. لەو رۆژدوە هونەرمەندە زۆرەکانی ئەڵمان و هۆلەندییەکان بە پەشێویی مانەوە، چونکە رۆدولف رابەری قوتابخانەیەکی هونەری بەرز و پێگەی هونەر و داهێنانیان بووە، ئەو ئیمپراتۆرەی پاش ئەو هات، کەسایەتییەکی لاتی هەبوو.

پراگ شوێنی کۆکردنەوەی چەندین گەنجینەی دەگمەن و گرانبەها بووە، هەموویان پارێزرابوون، کەس بۆی نەبوو لەو گەنجینەیەدا بەشداری دیداریان بکات، تەنها ئەوانەی هاوشانی ئیمپراتۆر بوون هاتوونەتە ناو ئەو گەنجینە نازدارە، ئەو نەیتوانیوە لەو شتە نایابانە دووربکەوێتەوە، شەوانە مومی داگیرساندووە و گەنجینەکان و بەرد و خشڵە گرانەکانی شاردیتەوە.

# گەنجینەکانی پاشایەتی

ئیمپراتۆر هەموو ئەو گەنجینانەی بە موڵکی تایبەتی خۆی زانیوە، نوێنەری بۆ هەرچوار لای جیهان ناردووە تا سۆراخی پارچەی هونەری نازداری بۆ بکەن، بەردەوام چاوی لە شتی تازەی بەرزبووە، لە هونەرە بەرزەکانی سەر حەریر و کاغەزی ژاپۆنیشی کۆڵیوەتەوە، ئەگەر نورژینالەکەشی دەست نەکەوتبوایە، وێنەی کۆپی داواکردووە، سەفیرەکانی بۆ پشکنین و دیتنەوەی تازە و نایاب گەڕاون.

ڕۆدولف بە تەنها شەیدا و پەرۆشی وێنە و نیگارنەبووە، زۆر کەرەستەی فەلەکی و شتی سەیر و دەگمەنیشی کۆکردیتەوە، ئەوەی بە گیانبازی ژیانی زانیبوایە دەستی بۆ هێنان و پەیداکردنی دەبرد.

ئیمپراتۆر شەیدای هێنانی هەموو شتێکی تازە و نامۆبووە، لە دوورەگەکانی مالدیفەوە گویزی هیندی بۆ هاتووە، لە چین هێلکە شەیتانۆکە و قۆچی ئاژەڵی کیویی و قوورکاریی بۆ هاتووە، هەموو شتی داواکردووە، هێلکەی نعامە و پەڕەمووچە و زیندەوەر و پەپوولە و شەیتانۆکە و گوێچکەی دەریایی هێناوە، هەرچی دەگمەن و نامۆ و سەیر و سەمەری لەو دونیایە پان و بەرینەی هەبووە، ئەو کۆیکردوونەتەوو داوای زۆرتر و جوانتر و گرانتری کردووە. زێڕینگرانی زۆر ویستووە، بێ سنووری دیمانە و دیتنی کاری وەستایانەی زێڕینگرانی ویستووە، تام و ئارەزووی زۆری لە دەستڕەنگینی ئەوانەوە بینیووە. کار و گەنجینەکانی جیوساب ئارکیمبولدۆ سەرنجی ڕاکێشاوە، لە ئاکاری کەسایەتی لە شێوەی مێوەو سەوزە و پەلەوەر و گۆشت و کتێبەوە تامی وەرگرتووە. جیوساب بە کارە ڕەنگینەکانی وەك کەسێکی ئەفسوناوی دەرکەوتووە، ئەو پیاوە شێوەی سەرمێز و ردێنە درێژەکەی و چوارشانییەکەی زۆر تایبەت و نامۆبووە. بە ڕێزکردنی مێوە شێوەی دەرهێناوە، گندۆرەی بۆ دەموچاو قەیسی بۆ ڕوومەت و گێلاس بۆ چاو و هەرمی بۆ لووت و هێشوو و گوڵەگەنم و جۆشی بۆ بسك و کەزی داناوە. نووسینی ناوی ئارکیمبولدۆ لە ڕۆژمێرەکەی (ئەنا) بە ڕێکەوت نەبووە.

# دوا کەرتی نانی ژیان

ڕۆدولف پراگی پایتەختی ئمپراتۆرییەکەی لـە سـاڵی ١٥٣٨ کردبـووە ڕوانگـە و هەواری هەرچی خەونزان و فاڵگەرەوەی ئەو جیهانە پان و بەرینە، پێناوی زۆری بڵاوی ئەو جیهانە کردبوو بـۆ هێنـان و داوەتکردنیـان، ئـەوانـیش بـۆ وەرکرتنـی دیـاری و شاباشەکانی هاتوون. ڕۆدولف بڕوای زۆری بە کیمیای کۆن هەبووە، زۆری لـە زانایـان کۆکردیتەوە و پارە و سامان و دیاری زۆری بـۆ تـەرخـانکردوون، تـا دەوایـەکـی بـۆ بدۆزنەوە تا بەردەوام بژییت و نەمر بمینێتەوە، هەموو ئەوان لە کۆشـکەی ئـەو و لـە ژوورێکی پەنای لاچەپەوە خەریکی کار بوون، کـەس بـۆی نـەبوو بـەبێ پرسـی پاشـا سەردانیان بکات، شوێنی نیشتەجێیەکەیان لەڕاستیدا شارێك بوو لەناو شارێکدا.

کافکا شەقامی زێڕی تایبەت بە فاڵگرەوەکان و فەلەکناسەکـانی بـە جیهـانێکی مـشەخـۆر دەزانـی، کۆشـکەکـەی بـە چـەنـد خـانووی بـچووکی ڕەشـی چـەمـاوی لەبەرامبەریەکی یەکرێزکراو دەبینی.

دوو گەنجە گەشـتیارەکەش ئـەو شـارەیان بـە دروسـتکراوەکانی سـەدەی ناوەنـد دەزانی، ئەوەی تێدا کیمیازانایانـەی بـەردیان کـەرم دەکـردەوە تـا تیـشکی مـانگ دەستگیربکەن، زۆرتر ڕۆیشتن تا خانووی بووکەکانیان بینی، بنمیچەکانیـان نـەوەنـدە نەوی بوون، دەسـتت بەرزکردبایـەوە بـە ئاسـانی دەیگەیـشتێ. ڕۆدولـف ئەوانـە زۆر هوشیاربوو، ورد و باش لە هەڵسوکەوتیانی دەکۆڵییەوە، بۆیان نەبوو لە خانوودکانیان بێنە دەرەوە، شەقامەکە پاسەوانی تایبەتی هەبوو، ڕۆژێکیان یەکێکیان بـۆ ڕابـواردن ڕۆیشتبووە دەرەوە لە ڕێگادا تووشی چەند بەگزادەیەك ببوو لەگەڵ ئەوان چوبووە ڕاو و شکار. ئەوانە بۆیان نەبوو لەگەڵ بەگزادەکانا هاموشۆیان ببێ، بۆیە لە تاوی تەنیـایی و دوورەپەرێزی ژیانیان، بەیەکەوە مانیانگرت، بڕیاریاندا ڕیشیان بتاشن، ڕۆدولف بـە زیندانیکردنیان لەناو قەفەسی ئاسن سزای هەموانی دا، تا هەموو لە برسانا مردن.

زۆر کەسی گیانباز سەردانی کۆشکی ئیمپراتۆریان کردووە، ئەنجامەکەیان گیرانیان بووە، لە تاوەرەی سپی و چاڵەکە، هەموو بەو شـێوەیە لەناوچـوون، ئـەوەی ڕزگـاری بووە، بەختی جیوردانو بوو کە لە ساڵی ١٥٨٨ سەردانی پراگی کردووە.

## فەیلەسووفێك لە كۆشكەكە

ئەو فەیلەسووفە ئیتالیە بە توندی شەڕی فەیلەسووفەكانی سەدەی ناوەند و هزری ئەرەستۆی كردبوو، تا بە سووتانی دوو ساڵ كۆتاییەكەی هات، پاش ئەوەی تاوانی لادانی و دووبەرەكی خرایە ئەستۆ.

بەردەوام ئەو دوو گەشتیارە گەنجە لەو شارەدا گەڕان، تا گەیشتنە شاری جوولەكەكان (جوزیفوف)، ئەوەی بەناوی ئیمپراتۆر جوزیفی دووەم كراوە، ئەو خاوەن بیرۆكەی نەهێشتی نەژادپەرستی و سەربەستی ئایینی بووە لە كۆتایی سەدەی هەژدەهەم. ئەو شوێنانە ناوی گەڕەكی چوارەمی وەرگرتووە، لەو شارە تەنها چەند كۆنە كەنیسەیەكی تێداماوە، وەك كەنیسەی (كۆنە نوێیەكە) و گۆرستانەكە و هوتێلی شارەكە ئەوەی سەعاتەكەی میلەكانی بە پێچەوانەی هەموو میلی سەعاتەكانا دەسووڕێت. سەعاتەكەی گەڕەكی جوولەكەكان وانەبووە، میلی ئەو سەعاتە بە پێچەوانە نەسوراوەتەوە، بەڵام هەموو لایەك ئەو روویان وەرگرتبوو.

ئەنا، مێردەكەی راگرت و وتی من بڕوا ناكەم ئەو كەنیسەیە لەو شەقامە بدۆزینەوە. پێشنیاری كرد بچنە شەقامی بولسكا و بەیانی بچنە فیسیەراد. ئەو شەقامە زۆر سەیرە، ئەوەی سەر بەو شەقامە بكات دیمەنی سەیر و نامۆی دێتە پێش، بە هیچ شێوەیەك لە گەڕەكەكانی تری پراگ ناكات، خانووەكانی نەخشەیان تازەیە، ئاكاری دەرەوەیە هاوشێوە نییە، پەنجەرەكانی گەورەن، شێوەیان جیاوازە، باڵكۆنەكانی بە كەوانە و دیكۆری جوانەوە بەبەرد نەخشاوە، پەیژەكانی دیكۆری شووشە و مەڕمەڕیان بۆدانراوە، ئاوێنەی جوانیان پێوەكراوە. بە گەیشتە ئەو رۆژە لەناو تراموایەكە دانیشتبوون و بەرەو هوتێلەكەیان دەچوون و ماندووبونیان پێوە دیارنەبوو، ئەگەرچی گۆڕستانی جوولەكەكان ئاڕامی و خەمۆكی كردبوون، ئەو رۆژە هەست و سۆزی تریان لا زیندوو دەكاتەوە.

## بارەگای ئەمیرەكان

فیسیەراد بە درێژایی رووباری فلتاڤا لەسەر چەقینێكی بەردەڵان هەڵكەوتووە، دیمەنەكانی زۆر جوانن، ئەو شوێنە بیرەوەری زۆری بە دەوڵەتی چیكیەوە هەیە، بە لای

چیکیەکان پیرۆزە، چونکە لە سەدەی دەیەمەوە بارەگای ئەمیرەکانیان بووە. کەنیسەی سانت بییر و سانت بۆل رووبەرێکی گەورەیان لەو گۆڕستانە داگیرکردووە، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە بە هۆی ناشتنی مردووی زۆرەوە ئەو رووبەرە گەورەی وەرگرتووە.

بەبەردەوامی پارێزگاری کەنیسەکە کراوە، بۆیە دیمەنەکانی جوانی و نازداری پێوەدیارە، لە بەشی یەکەمی کەوانەکانی رینسانسی نوێیان پێوەیە، لە ژێرەوەشی چەند گلکۆیەکی هەیە، لە تەنیشت دەروازە سەرەکییەکەی گۆرستانی نیشتیمانی هەیە، (پێگەی سەرکەوتن)، چەندین کەسایەتی رۆشنبیری و ئەدەب و هونەری شێوەکاری تێدا نێژراوە، لە لوتکەی ئەو شوێنە کلگۆی پەیکەرێك بۆ کەسایەتیەکی رەمزی باڵدار کرنۆش دەبات، ئەویش (بەرهەمی شار)دکەیە.

لە هزری کۆمەڵگەی نیشتیمانپەروەران (سقاتوبور) دروستکردنی کەنیسەیەکی چیکی هەبوو، تا خۆی لە باڵای کەنیسەکانی نەتەوەکانی تری ئەوروویی بدات، ئەو هزرەیان کردە راستی و لە ساڵی ١٨٩٣ کەنیسەکەیان تەواوکرد. لە لوتکەی بەرزی کەنیسەکەوە هیمای تاکی کەنیسەی سلاڤانە، کە رەمزی ئەو کۆمەڵگایەی هەیە، پەیکەرەکە سێ دەستە و بازنەیەکیان هەڵگرتووە، رەنگە فەرمانێك بۆ هەموان رابگەیێنێت و بڵێ:

یارمەتی بدە و بیربکەرەوە و خۆت لە بیر نەچێت!

کە کەنیسەکە تەواوبوو سەرەتا چەندین نووسەر و شاعیر و گەورە پیاوانی زانست و پاشان هونەرمەندانی پەیکەرتاشین و وێنەکێشان و بۆیەکردن و مۆسیقاژەن و ئەکتەر و توێژەرو مامۆستای زانکۆو گەورە وەرزشوانان و کەسایەتی گەورەی جیهانی و ناسراوانی ئابووری و سیاسی و بازرگانی سەردانیان کردووە و پێشوازی بەردەوام بووە.

کای و ئەنا سەردانی گۆڕی دفوراك و سمیتانایانکرد، لە تەنیشت ئەوانەوە گۆڕی کافکاش بەدیارکەوت. دیارە ناوەکە مەبەست لە نووسەرەکە نییە، بەڵکو پەیکەرتاش بوهومیل کافکابووە، چونکە ئاشکرایە نووسەر فرانز کافکاش لە گۆڕستانی جوولەکەکان نێژراوە.

## بەیەکگەیشتنەوە

لەو گەشتەدا بەبێ ئەوەی هیچ رووی دابێت و هەستیان بە هیچ شتێ کردبێت، (کای) نارەحەت ببوو، خەمێکی زۆری پێوە دیاربوو، ئەوەندە خەمگین بوو نەیدەتوانی بجولێتەوە. هەرچەندە لە مەبەست و ئەنجامەکەیان نزیك دەبوونەوە لە مێژوو و ژیان نزیك دەبوونەوە، لە بۆنی رێگاکان لە رەگەکان و بینینی ئەوەکانی پێشوو نزیك دەبوونەوە، خەمبارتر دەبوون. (ئەنا) دەیووت وزەو هێزی نەتەوەکانی ئەورووپی تەنها لەسەر زیندووەکان نییە، ئەو هێزە بە مردووەکانیشەوە دیارە، لە کۆتاییش لە گۆرستانەکەوە ساردییەکی نامۆو سەیری جیاواز لە تابلۆکانی ناو مۆزەخانە تاریکەکان دەرکەوت. ژن و مێردەکە لەبەردەم گۆڕی نووسەر و شاعیر و وەرگێر (کارال کاباك) راوەستان، ئەوەی لە رۆمانە جوانەکەی (رۆڵ) پێشبینی رووخانی فاشیەتی کردووە، یەکەم کەس بووە لە جیهان وشەی رۆبۆتی بەکارهێناوە. رۆیشتن تا گەیشتنە سەر گۆڕێکی بەشێوە کلاسیك گۆڕی (کارال هینك میشا)، بەرزتری نوێنەری رۆمانسیەتی چیکی و دامەزرێنەری شیعری هاوچەرخ، کە شیعرەکانی هەموو نەوەکان بە بەرزی رایانگرتووە. بەرەو دەروازی سەرەکی دەرۆیشتن لە بوارەکەی تەنیشت کەنیسەکە نووسینێکیان هاتە پێش کە تێدا نووسرابوو، لە سێدارەدرا و هەرگیز نەشاردرایەوە.

بە خوێندنەوەی ئەو دروشمە (ئەنا) هەستی بە ماندووبوون و نارەحەتی کرد، داوای لە مێردەکەی کرد بەرەو رووبارەکە پیاسەیەك بکەن، لەو رۆیشتنەدا (کای) هاواری کرد .. تەماشا کە .. تەماشای ئێرە کە .. ماوەیەکی زۆر دڵەکوتەی گرت، نەیدەزانی بگرییێت یان پێبکەنێت، کەنیسەیەك دەکەوێتە سەر رووبارەکە و لە پشتی دیوارە درێژە رووخامەکە قەدی دارێکی بەتەمەنی بەسەردا شۆڕبوویتەوە، پرسیارەکەش ئەوەیە چۆن بچینە ناوەوە و دەروازەکە بێ کلیل ببڕین؟

ئەنا وتبووی، وا باشە خاوەنەکەی بدۆزینەوە تا بزانن مەبەستمان لە بۆ چوونە ژوورەوە چییە. گومانی ئەوەی هەبوو خاوەنەکەی لە ژیاندا نەماون، یان دوور

کەوتوونەتەوە، رەنگە لە پراگ بژین. لەبەرئەوەی ئێمە کاتمان بە دەست نەماوە، بۆیە بۆمان ناکرێت بگەینە مەبەست.

کای گەیشتە ئەو رایەی چوونە ناوەوەی کەنیسەکە ئاسان نییە، چونکە ئەو کەنیسەیە دووجار لە کاتی شەڕەکە شوورەی بۆ کراوە، ئەگەر باپیری ئەناش بۆی کرابێت بچێتە ناوەوەی ئەوەشیان ئاسان نەبووە. ئەنا بڕوای پێهێنا کەوا باپیری نیشارەتی بە شوێنێکی نهێنی داوە و ئەو شوێنەش لەو شوێنە دەچێت. کای لە چواردەورەی بینایەکە دەسووڕایەوە و ئەناش پێکەنینی دەهات، سەرنجی بە بوونی کولانکەیەک کرد، سەرەتا وای هەستکرد لەو شوێنە هیچ نادۆزێتەوە، کە دەستی بۆی درێژکرد، پەنجەی بە تەڕاتییەك کەوت، زۆرتر دەستی بۆی خشاند، بینی جانتایەکی پیستە، ئەنا بە خێرایی بۆی چووە پێشەوە و پیسایی و قەتماغەکەی سەری هەڵگرت، کای داوایکرد جانتاکە بشارێتەوە، مەعقول نییە خەڵك ئەوەی بە دەستییەوە ببینن. ژن و مێردەکە بە نزیکترین تراموای گەیشتنەوە هوتێل، جانتاکەیان کردەوە، چەندین بەڵگەنامەی لەناوبوو، بە چەندین کاغەزی رۆژنامە پێچرابوو، لە قووتوی ئاسنی دانرابوون، جانتاکە لەبەر گۆڕینی ئاووهەوا و ئەو کاتە زۆر سپی دیاربوو هیچی بەسەردا دیار نەبوو.

## بەڵگەنامەکان

بە ئاسکی و لەسەرخۆ بەڵگەنامەکانیان کردەوە، لەبەرئەوەی جوان و باش پێچرابوون، زۆر باش بوون. بە کردنەوەی نووسراوەیەك ئەوەیان خوێندەوە:

دەزانم والنبرگ گیراوە و نۆرەی ئێمەش دێت، ئێمە بۆ دوارۆژی گەلانی ئەورووپا و رزگارکردنی هەزارەها کەس کۆششمان کردووە.

لە بەڵگەنامەی دووەمیش وەسفی ئەو شتانەی تێدابوو کە لەلایان بووە، وەك ئەنگوستیلە و بازن و چاویلکە و زنجیر و مەرجان و قۆجێکی تاك و جۆرەها پەرەمووچ و وێنەی رەنگینی ملوانکەیەکی ئەلماس. ئەنا ئەگەرچی گۆڕی باپیرانیشی نەدۆزیبووە

هەستی بە لەرزێك کرد، چونکە ئەوەیان زانیارییەکی باشە بۆ دۆزینــەوەی شــتەکـان. کای ویستی جانتاکە فڕێ بدات، بەڵام حەزی دەکرد جانتاکە بە دایکی نیشان بـدات، ئەوەش دڵی خۆش دەکات چونکە جانتاکە موڵکی باوکییەتی.

## جێهێشتنی پراگ

بەیانییەکەی ژن و مێردەکە بە دڵی پـڕ سـووتانەوە لـە پـراگ دەرچـوون، لەبـەر رۆشنایی کزەکەی ترێنەکە لە بارەکەی حەزیان لە خواردنەوەی بەرداخێك شەراب بوو، ئەو بارە لە ساڵی ١٩٨٢ لەلایەن جیرار کالی بە شێوەیەکی هونەری بەرز رازاوەتــەوە، ئەو فارکۆنەش تاکە فارگۆنە مێژووەکەی بۆ سەردەمێکی کۆن دەگەڕێتەوە. بە کورتی فارکۆنی تایبەتی خواردنەوە نەبوو، ئەوەی خواردبیتەوەش لە چێشتخانەکە بووە.

ئەنا دەرگاکەی کردەوە و تەماشایەکی دەرەوەی کرد، ئـارامی بـەرقراربوو، نێـوان فارکۆنەکان و بوارەکان داخرابوون، بە دیتنی ساڵۆن و بوار و فارگۆنـەکان هەسـتیکرد لەناو کۆشکی ئەمپراتۆرێك دایە. سێرڤیسە ئیتالییە تەمەن پەنجا ساڵییەکـە، چـەنـد ساڵێکە لەو ترێنە کاردەکات، پێکێك شەرابی پێشکەشکرد، لە تەنیشتییەوە چـەنـد کەنجێك لە بیانۆیەکەیان ئاوازی سازکاریان دەبەخشی، ئەویش کوێی بۆ شل کردبوو.

رەوشەکە خۆش بوو، ئێوارەکە ژن و مێردەکە لە رێـستورانەکە نانیـان دەخـوارد، قەنەفـەکـانی لویــسی شــازدەهەم زۆر ســاز و خــۆش بـوون، پـەردە نازدارەکـانیش شوێنەکەیان سەرفرازتر کردبوو، پانکە مـسەکان زۆرتر دیمەنەکەی بە شـەوقترکردبـوو. بەیەکەوە لە رۆژانەی سەفەرەکەیانەوە دەدوان، لە تەنیشتیانەوە کۆمەڵـە گـەنجێکیش بە پێکەنین رەوشێکی تایبـەتیان بۆ خۆیان خوڵقاندبوو. سەرنشینەکانی ترێنەکـە زۆری ئەمریکی و ئینگلیزی بەتەمەنی هێمن بـە رەوشـت بـوون. لـە تـەنیـشتیانەوە ژن و مێردێکی تەمەن چل ساڵانە هەبوو، نیگایان لەیەکتری دەبڕی و لە ناخەوە پێدەکەنین.

## ترێنی بەگزادەکان

ترێنە خێراکەی خۆرهەڵات ئەوانەی گەشتیان پێکردبوو یان بە حەسرەتی بوون، بە ترێنی بەگزادەکان ناسرابوو. وەك چۆن ئێمە بۆ دۆزینەوەی بوارێك بۆ دەرکەوتنی راستی و ئاشتی سواری ئەو ترێنە بووین، بۆیە ئەو ترێنە هێمای ئاشتی وڵاتانی ئەورووپا بووە، کە ژن و مێردەکە بەرەو فارگۆنەکەیان دەچوونەوە لە پەنایەکەوە

هەستیان بەبوونی تارماییەك کرد، لە کۆتایی بوارەکە تارماییەکە نەما، بۆیە کای وتبووی، ئەوەش ئەفسوناویی ترێنەکەیە، جا ئەو تارماییە راستە یان نا..

## پارچە ئەڵماسە سەیرەکە

کە گەڕانەوە نیویۆرك ئەنا تا جانتاکە بە دیاری پێشکەشی دایکی بکات، ویستی خاوێنی بکاتەوە، کە دەستی بردە ناوەوەی هەستی بە بوونی شتێکی سەیرکرد، شتە بچووکەکە لەنێوان بەرگە قوماشەکەی و بەرگە پێستەکەی بوو، زوو بانگی کای مێردی کرد، ئەویش دەستی بردە ناو جانتاکە، زانی شتەکان سێ شەشپالۆی رەقە، کە شتەکانیان هێنایە دەرەوە زانییان پارچە ئەڵماسی زۆر جوانن. وێنەی ملوانکە زێرینەکەی لە گۆڕستانەکەی پراگ دۆزیبوویانەوە لە خەیالیان جیانەدەبۆوە، ناوی خاوەنی خشلفرۆشەکەی لەسەردا مابۆوە و دەستنووسەکەی کە نووسیبووی:

بۆ خێزانەکەم، خۆشەویستەکەم ئەناتۆل نازارتشۆك، دەخوێندرایەوە.

ملوانکە و بازنەکان لە شێوەی دڵۆپەیەك بوو، دوو گوارەشی تێدابوو، تا ئێستا ئەنا هەڵیگرتوون، هەمووی بردووە لای زێرینگرێك بۆی پاککردبوونەوە و جوانییەکەی جارانی نوێ کردبۆوە و ئەڵماسەکان لەسەر خشڵەکان دانابۆوە.

## گێڕانەوەی نهێنییەکە

پاش ئەوەی ئەنا و کای کارە گیانبازییەکەیان بۆ دایك و باوك و هاوڕێیەکانیان گێڕایەوە، لەبەرئەوەی ئەو خاوەن بیرۆکە و دۆزینەوەکە بووە، بۆیە دایکی رازی بوو خشلەکان بەکاربهێنێت، ئەویش رازی بوون جانتا کۆنەکە بپارێزێت. ئەگەر خشلەکانیان بفرۆشتبوایە ئەناو کای بە پارەکەی دەیانتوانی خانوویێکی جوانی پێ بکڕن، بەڵام ئەنا تەنها دوو گوارەکەی هەڵگرتەوەو ئەوانی تر بۆ بەرژەوەندی سەنتەری توێژینەوەی قەڵاچۆکردنی نەخۆشی کانسەر فرۆشت، ئەوەشی بە رووی بەو ژنە دکتۆرەی دایەوە کە پشکنینەکەی ئەوەی بە هەلە کردبوو. ئەنا وتبووی، ئەوەی رووی دا، فێری هێوریی و لیبووردەیی کرد، ئەوەش موعجیزەیەك بوو. ئێستا ئەو بانکێکی گەورە لە نیویۆرك بەڕێوە دەبات و لە کاتیدرانی رووسی سروودی مەسیح تۆ چارەسەری دەخوێنی.

## کۆتایی

هێلی رۆیشتنی ترێنی خێرای خۆرهەلات لەو رۆژانەدا بە فاکتەری جیوپۆلیتکەوە بەندە، سنووری ئەورووپی تازە پاش هاتنی رۆمانیا و بلگاریا بۆ ناو یەکێتی ئەورووپی دەبڕێت، هێلەکە بۆ دەریای رەش و تەنگەبەری قەوقازیی دەوڵەمەند بە سەرچاوەی وزە درێژدەبێتەوە، ئەو وزەیەی ١٠ ٪ وزەی سووتەمەنی جیهانی لێ کۆبوێتەوە، چارەگی ئەو وزەیە بەو ناوچەیە رەتدەبێت. ئێستا لە هەموو کاتێك زۆرتر پراگ و بودابیست بوویتە خاڵی پەڕینەوە بۆ ناو ئەورووپا، ڤیێناش پایتەختی ئەو ترێنە خێرایەی خۆرهەلات بووە، کە بە هێمنی و بە ئارامییەکەی ناسراوە، ئەوەش لە ئیمپراتۆرییەتی ئەمساویی هەنگارییەوە بۆی ماوەتەوە، لەو رۆژگارە بە هیمەتی سەرمایەداری زۆردەو بایەخ و هێزەکەی لە ئەورووپای ناوەڕاستەوە پەیداکردووە، رۆڵی ئەو ترێنە ئەفسوناوییەش زۆربووە لە یەکێتی و هێزی ئەورووپای ناوەڕواست و خۆرهەلاتەکەی، ئەوەی ماوەتەوە مەسەلەی هاتنەوەوەی تورکیا بۆ ناو یەکێتی ئەورووپی و دەوری لە دوارۆژی ئەورووپا، ئەنا لەو گەشتەوە فێری تێگەیشتن بوو لەو پێشهاتە تازانە.

## لەدایکبوونی دووەمی ئەفسانەکە

زۆرجار ڕێکەوت ئەو ترێنەی پاراستووە، پاش ئەوەی فارکۆنەکەی نوستنی پاریس بودابیستی لە ساڵی ١٩٥٩ نەهێشت، دواییش فارکۆنە تایبەتیەکەی بوخارستیشیان نەهێشت، دوا گەشتی ڕەسمیشی لە ئیستگەی لیون بووە لە ١٩ ی مایۆی ساڵی ١٩٧٧ بووە. ئەو فارکۆنانەی بۆ نووستن لەلایەن دەستەکەی جۆرج نیجلماکرس دروستکران بە هۆی ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتەوە جیهانی بەیەك بەستایەوە و کەلتووری میللەتانی لەیەکتر نزیك کردیتەوە. دەستەکە بایەخی ئەو مەسەلەیان زانیبوو بۆیە لە ساڵی ١٩٨٧ ترێنی خێرای خۆرهەڵاتیان لە بولمان دامەزراند، لە ساڵی ٢٠٠٣ نوژەنکراوەتەوە و هەموو پێوانەکانی ناسراوی ئارامی و سەلامەتییان بۆی دابینکردووە، دیکۆری نایاب و کەرەستەی تازە و پۆشتەی تایبەتی کارمەندانی بۆ کراوە.

ئەو ترێنەی بولمان ئیمرۆ وەك ترێنێك و هیمایەکی مێژوویی بە حەوت فارکۆنەوە ناسراوە، لە کۆتایی بیستەکانەوە دروستکراوە و ئەورووپای خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی دەبڕێت، ئەو ترێنە بەشێکە لە ترێنی شین و ترێنی ئەستێرەی باکوور و ترێنی کوت ئازور بولمانی خێرا، یان ترێنی ریڤێرای خێرا و ترێنی تیری زێر ........ ئەو ترێنەی ئێمە سەفەرمان پێکرد ئیمرۆش دڵی کەشتیارانی لەلایە، خەونی ئەوەیان ماوە ئەو ترێنە ڕۆژێ بگەڕێتەوە کار، زۆر پرسیار دەکەن، دەبێ ڕۆژێ ئەو ئەفسانەیە دووبارە لەدایك بێتەوە، دەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێت ئەفسانەی گەورە وەك خۆشەویستی گەوردیە هەرگیز نامرێت.

**لە ٢٠٠٦/١١/٢ تا ٢٠٠٦/١١/١١ لە ڕۆژنامەی القبس کوێتی بڵاوکراوەتەوە.**

# فلادیمێر فیدوروفسکی

نووسەری رووسی فلادیمێر فیدوروفسکی لەو رۆمانەدا چەندین ئەفسانە و راستیی لەسەر ترێنی خێراکەی خۆرهەڵات تۆمارکردووە. ئەو ترێنە وەسیلەیەکی یەکەمی گواستنەوە بووکە پاشاکان و ئەستێرەکانی هونەرو گیانبازان و جاسووسەکان و ژنە سۆزانیەکان بۆ نێچیرێکی چەور سواری ببوون.

نووسەرەکە وەرگێری تایبەتی سەرۆکی سۆڤیەتی بریجنییف و پاشان قسەکەری یلتسن بووە. لە دیداری تایبەتی شیراک و یلتسندا دیمانەی لەگەڵ شیراک بووە، بۆیە کە هاتووتە فەرەنسا بە پێشنیاری سەرۆک شیراک رەگەزنامەی فەرەنسیی وەرگرتووە. ئێستاش مامۆستای وانەبێژە لە زانکۆکانی فەرەنسی و بابەتی تایبەتی لە ماوەی شەری سارد دەداتەوە. کاریش لە نووسینی نهێنییەکانی مێژووی هاوچەرخی رووسی دەکات، لەوانە رۆمانی سانت پیترسبۆرگ و رۆمانی کرملینە.

رۆمانی (کێرانەوە) ترێنە خێراکەی خۆرهەڵاتیش ژمارە نۆزدەی رۆمانەکانییەتی، لە فارگۆنەکانی ئەو ترێنە زۆر دیدار و کۆبوونەوە و سەربردەی تێدا روودا‌وە، زۆریان دەوریان لە گۆڕانی ناوچەکە و جیهان و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەبووە.



## پێناسەیەکی نووسەر

لە ١٩٥٥ لـە شـاری دێرینـی (هـەولێر) لەدایکبوویمە.

ئامۆژگـای تـەکنلۆژیـای بەغـدام تەواوکردووە

تـا لـە ولات دەرچـووم فـەرمانبـەری شارەوانی هەولێر بووم.

لە سـالی ١٩٩٨ دوە لـە ولاتـی سـوید دەژیم.

## چاپکراوەکانم ...

لە یادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، ١٩٨٥ کتێبی (هـەولێر)م بـە قـەبارەی ٣٦٥ لاپەرە ئامادە و چاپکرد.

هەر لە شـارەوانیدا لـە سـالّی ١٩٩٤ دا، ١٢ ژمـارەی رۆژنامـەی" هـەولێر "م دەرکرد.

کەلاوە .. ١٩٩١ ریپۆرتاژ / بۆ ئۆردوگاکانی دەڤەری هەولێر.

دیوەخانی فلێن ... رۆژانەو ریپۆرتاژە / لە ١٩٩٩ لە رۆژنامەی " ئالآی ئازادی " زەحمەتکێشان لە دە ئەلقەی درێژ بلاوکرایەوە.

هەولێر .. تا دبلن ! ٢٠٠٠ - ریپۆرتاژ / زانکۆی ئازادی بەرلین.

بەغدا.. بۆ هەولێر ! ٢٠٠٠ - ریپۆرتاژ / سویدو سلێمانی.

مەملەکەتی فارگۆنەکان ٢٠٠١ - ریپۆرتاژ / سلێمانی.

بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو ٢٠٠١ - رۆمانی کابریـل مـارکیز، لـە ژمـارە ٢٥ی گۆڤاری " ئاینده " ی سلێمانی بلاوکرایەوە، وەك ئامیلکەش بلاوکرایەوە.

ده رۆژەكــەی هــەولێرم .. (١١) وتــارو ریپۆرتــاژبوو / لــە گۆڤــاری (گــولآن) ی هەولێرو رۆژنامەی (كورد) لە ئوسترالیا بڵاودەكرێتەوە.

رێگای دوورم بۆ ئازادی، نیلسۆن مانــدیلا/ وەرگێــڕان. لــە هــەولێر لــە دەزگــای موكریانی بڵاوكرایەوە.

سارد، یان گەرم .. (١٢) ریپۆرتاژبوو / لە رۆژنامــەی (هــەواڵ) ی ســلێمانی لــە یولیو ٢٠٠١ ـ ینایری ٢٠٠٢ بڵاوكرایەوەو وەك نامیلكەش بڵاوكرایەوە.

فارگۆنەكان ...... ریپۆرتاژو بیرەوەرییە لە دەزگای بدرخان لە هەولێر بڵاوكرایەوە.

مەملەكەتی كەلاوە ... وتــارو پێناســەی بیناســازی كوردییــە وەك نامیلكــە لــە وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر بڵاوكرایەوە.

كۆریا پێناسەو مێژووی كۆریای باشوور، لە خانەی وەرگێڕان لە هەولێر ٢٠٠٧..